محەمەدی مەلاکەریم

## لە ڕێگای ئەدەبەوە

# لە پێناوی "نالی"دا

"دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی"یەکەی دوکتۆر مارف خەزنەدار
لە تای ترازووی ڕەخنەدا






چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بغداد - ١٩٧٩

لە جگە ڕگۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراب
بێخەتا کەس نیی یە ڕازی کە لە ئەولادی دری

«نالی»

محمدی مەلاکریم

لە ڕێگای ئەدەب و

# لە پێناوی «نالی» دا

«دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی»یەکەی دوکتۆر مارف خەزنەدار لە تای ترازووی ڕەخنەدا

ئەم کتێبە لە ئامادەکردنی
منتدى إقرأ الثقافي
بوو

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا - ١٩٧٩

# بەشی یەکەم

## هەڵسەنگاندنی پێشەکی و پاشبەندە عەرەبی یەکەو پاشەکیی کتێبەکەی

دوکتۆر مارف خەزنەدار

## (١)

لە دوارۆژەکانی ساڵی ١٩٧٧دا ( دیوانی نـالی و فەرهەنگی نالی )ی دوکتۆر مارف خەزنەدار کەوتە بەردەستی خوێندەوارانی کورد •

ئـەم کتێبەی دوکتۆر مارف بریتی‌یە لە سەرەتایەك لـەم باسـانە پێکهاتووە : کورتە مێژوویەکی ژیانی نالی لە چەند دێرێکدا بە ناوونیشانی : نالی ، مێژووی بڵاوکردنەوەی شیعری نالی ، نالی‌و شیعری لای خۆمان و لە ڕۆژەڵاتدا ، نالی‌و شـیعری لـە ڕۆژاوادا ، دیوانی دەسـنووس‌و بەیازو دەفتەری شیعری کۆن‌و دیوانی چاپکراوی نالی بنچی ئەم چاپەن ، ئـەو شیعرانەی هیی نالی نین ، شیعرێکی تورکی بە ناوی نالی‌یەوە تۆمارکراوە ، بەرنامە بۆ تێگەیشتنی نالی ، فەرهەنگی دیوانی نالی ، دوا وشە ، سوپاس • ئەنجا پاش بڵاوکردنەوەی زەنکۆگرافی تۆ لاپەڕە دەسنووس‌و لاپەڕەیەکی گۆڤاری ( ڕۆژی کورد ) کە لە ساڵی ١٩١٣دا لە ئەسـتەموڵ دەرچووەو چەند پارچە شـیعرێکی نالیی تیا بڵاوکراوەتـەوەو ، لاپەڕەیـەکی کتێبی ( ئەنجومەنی ئەدیبان )ی ئەمین فەیضی کە پارچە شیعرێکی‌تری نالیی تیـا لەچاپدراوە ، هاتووەتە سـەر دیوانەکە کە کردوویە بە دوو بەشـەوە : ( غەزەل )و ( قەسیدە )[١]و هەردوو جۆرەکەی بەپێی پیتەکانی ئەلف‌وبێ

---

(١) لەبارەی دابەش‌کردنی شـیعرەکانی نالی‌یەوە بـە دوو بەش ( غەزەل )و ( قەسیدە ) ، بە ڕای من پێویستی‌یەك بۆ ئەم‌کارە نی‌یە، چونکە زوربەی خوێندەوارانی کورد شارەزای ئەو جیاوازی‌یە هونەری‌یە نین کە لەنێوان غەزەل‌و قەسیدەدا هەیەو ، ئەم دابەش‌کردنەی دوکتۆر کردوویەتی ئەبێ بە هۆی ئەوە کە کاتێـکی زۆرتر بە گەڕان بەدوای پارچـە شیعرێکدا

ڕێکخستووه • پاشان هاتووەتە سەر فەرهەنگی نالی کە لەوێدا ناوی ناوە ( فەرهەنگی دیوانی نـالی ) [٢] • لە دواییشدا ســێ لاپەڕەی لەبارەی کارەکەیەوە بە عەرەبی نووسیوە ، جا پاشەکیی‌یەکیشی بۆ داناوە • ئەوجا بە پێڕستی غەزەل‌و قەسیدەکان کتێبەکەی دوایی هێناوە •

لەبەرئەوە کە دوکتۆر مارف مامۆستای زانکۆیەو پایەی (یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە کۆلێجی ئەدەبییات لە زانستگای بەغدا )ی هەیەو ، بڕوانامەی بەرزی کاندیداتی بەدەستەوەیەو ، سەری‌زمان‌و بنی‌زمـــانی باسی (عیلم)و

---

بەرنەسەر کە نازانن لە بەشی غەزەلدایە یا لە بەشی قەسیدەدایە . یا ئەبوو دوکتۆر لــە سەرەتاکەیدا واتــای هونەریی ئــەم دوو جــۆرەی لێ‌بدایەتەوە . بۆیە وا من لەجیاتیی ئەو ئەم کارە ئەکەم‌و هیوام‌وایە بۆ دۆزینەوەی زووی هەر پارچە شیعرێکی نالی لە دیوانەکەی چاپی دوکتۆر مارفدا ، مایەی سوود لێ‌وەرگرتنی خوێندەواران بێ .

غەزەل : شیعرێکە لە چەند بەیتێ پێکهاتبێ ( بەعادەت لە حەوتەوە تا دوازدە) کە سەنگیان ئەوەندەی یەك بێ‌و دوایی نیوەی یــەکەمی بــەیتی یەکەم‌و نیوەی دووهەمی هەموو بەیتەکانی لە یەك قافیە بێ‌و بابەتەکەشی باسی یارو خواردنەوەو دڵداری بێ [دکتر محمد معین ، فرهنگ فارسی، جلد دوم ، ص ٢٤١٢ ، تهران ، ١٣٤٣ ] . قەسیدەیش پارچە شیعرێکە وەك غەزەل بەیتەکانی سەنگیان وەك یەك وابێ‌و دوایی نیوەی یەکەمی بەیتی یەکەم‌و نیوە دووهەمەکانی هەموو بەیتەکانی یەك قافیەیان بێ . قەسیدە لە غەزەل درێژترەو خاوەنەکەی لە تەواوی قەسیدەکەیدا یەك بابەتی وەك ئامۆژگاری‌و وێڵ‌و تەعریفـو کاروباری کۆمەڵایەتی‌و ئایینی‌و شتی‌وای باس‌کردووە [ دکتر محمد معین ، فرهنگ فارسی ، جلد دوم، ص ٢٦٨٣ ، تهران ، ١٣٤٣ ] . ڕاســتەکەی جۆری دابەش‌کردنەکەی دوکتۆر مارف بەتەواوی لەگەڵ ئەم تەعریفانە ناکەوێتە یەك .

(٢) ئەم ڕستەیە لە ناوی کتێبەکەدا کە لەسەر بەرگەکەی و لە پەڕەی یەکەمی نووسراوە ، وشەی « دیوانی »یەکەی پێوە نی‌یەو تــەنها « فەرهەنگی نالی »یە . ئەمەش بە بەراورد لەگەڵ ڕستەی « دیوانی نالی »ی ناوی کتێبەکەدا لەوانەیە مرۆی بێ‌ئاگا بەهەڵەدا بــەرێ و کارێکی لێ بکا وا گومان ببا کەوا نالی وەك دیوانێکی شیعری هەیە ، فەرهەنگێکی زمانیشی هەیە .

(عالم)و ( رێوشوێنی زانستییانه )و ( لێکۆڵینەوە )و ( تێگەیشتنی نالی)و (جیهانی نالی )و شتیوایەو ، ئەم کتێبەشی بەشێکە لەو بەرهەمەی لەئەنجامی بیرکردنەوەو خۆخەریککردن بە نالییەوە هاتووەتە کایە کە لە ١٩٦٣وە ، کاتێ کە لە یەکێتیی سۆڤیەت بووە، تا یەکی نیسانی ١٩٧٥ی گرتووەتەوە[٣] [ بەڵکو لەوە پاشتریش !] و بۆئەوەی بزانین ئەم شتانەی ئەو هەمیشە لێیان ئەدوێ ، چەند لە کارەکەیدا هاتوونەتەدیو ، لەپێناوی ئەوەشدا کە ئەو خوێندەوارە کوردانەی کاتی خوێندنەوەیەکی وردی بەرهەمەکەی دوکتۆر مارفیان نییە یا ناتوانن لەکەموکورتییەکانی بگەنو کونو کەلەبەرەکانییان پێ نادۆزرێتەوە ، بتوانن بەرهەمی کاری دوازدە ساڵی دوکتۆر مارف باش هەڵبسەنگێنن ؛ بە پێویستی سەرشانی خۆمم زانی بەم ئامیلکەیە بەسەر کارەکەی دوکتۆردا بێمەوەو ئەو هەڵەو ناتەواوییانەی دەرکیان پێ ئەکەم بییانخەمەڕوو . لەم کارەمدا ڕێگای خۆم داوە سوود لەو بابەتانەش وەربگرم کە لەم دواییەدا لەبارەی ئەم کارەی دوکتۆر مارفەوە نووسراون[٤] . ڕاستەکەی زوربەی بۆچوونەکانی ئەو برادەرانە ، من خۆیشم بەر لە بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی ئەوان بۆیان چووبووم ، بەڵام هەندێکیشیان بەتایبەتی هەر هیی خۆیانە . هەرچۆن بێ دیارە ئەوەی ئەوان

---

(٣) دوکتۆر مارف خەزنەدار ، دیوانی نالیو فەرهەنگی نالی، بەغدا ، ١٩٧٧ . لاپەڕە ٤٠٨ .

(٤) ئەوەی تا ئامادەکردنی ئەم بابەتە ، لەمڕووەوە بەرچاوم کەوتبێ ، ئەم دوو سەرچاوەیە : محەمەد عەلی قەرەداغی ، ڕێبازی لێکۆڵینەوەو لێکۆڵینەوەی ئەمجارەی دیوانی نالی ، ڕۆژنامەی هاوکاری ، ژمارە ٤٠٤ی ١٩٧٧/١٢/٢٢ ، لاپەڕەی سێهەم ؛ کمال غمبار ، وجهة نظر حول دیوان نالي و قاموس نالي ، عرض و تعلیق ، جریدة العراق ، العدد ٥٦٥ ، ١٩٧٨/١/٥ ، الصفحة الثالثة . پاش نووسینی ئەم کتێبەش ئازاد عبدالواحد لە ژمارە ٤٤٠ی ١٩٧٨/٩/١١ی ڕۆژنامەی هاوکاریدا وتارێکی بە ناوونیشانی « دیوانی نالیو فەرهەنگی نالی » بڵاوکردەوە .

پێشتر نووسیویانەو من لێرەدا دووبارەم کردووەتەوە ، هەر ئەبێ بە هیی ئەوان دابنرێ ، هەرچەند من خۆیشم بۆی چووبم ، چونکە ئەوان بەر لە هەرکەس بلاویان‌کردووەتەوەو بەوە بوون بە خاوەنی .

هیوام وایە بەم کارە بچووکەم یارمەتی‌یەکی کەمی خوێندەوارانی کوردم دابێ‌و ، کارێکیشم کردبێ کە دوکتۆر لە « لێکۆلینەوە فراوان‌و دوورو درێژەکەیدا لە ڕوخسارو ناوەڕۆکی شیعری نالی‌و دیارکردنی جێگای شاعیری مەزندا لە ئەدەبی کورددا » [٥] ، کە خۆی وای لێ چاوەڕوانی ئەکا « فراوانترین کتێبی کوردی بێ لەسەر شاعیرێك نووسرابێ »[٦] ، لە

---

(٥) تێکستی ناو دوو کەوانوولکەکە هیی دوکتۆر مارف خۆیەتی لە پەراوێزی لاپەڕە ٤٠٨ی کتێبەکەیدا. لەبەرئەوەی کە لاپەڕەکانی پێشەکی‌و پاشەکیی کتێبەکەی دوکتۆر مارف ئەوەندە زۆر نین ، بە پێویستم نەزانی هەر ڕستەیەکی ئەوم خواستبێ، بخوێن بگێڕمەوە بۆ سەر ئەو لاپەڕەیەی کتێبەکە کە ئەو ڕستەیەم لێ وەرگرتووە تەنها لە شوێنێکا نەبێ کە ڕستەکەم بە دەسکارییەوە وەرگرتبێ ، بەلام ئەیخەمە ناو چوارچێوەی دوو کەوانوولکەوە تا بخوێن بزانێ هیی دوکتۆرە. هەر دەسکارییەکی ڕستەیەك یا تێکستێکی دوکتۆریش بکەم، بۆئەوەیە کەوا لەگەل داڕشتنی ڕستەکەی خۆمدا بگونجێ ، یا بۆ ڕاستکردنەوەی هەلەیەکی زەقی ڕێزمانی‌یە وەك لە ڕستەی دەسکاری‌کراوی پەراوێزی داهاتوودا .

(٦) دوکتۆر مارف خەزنەدار ، سەرچاوەی پێشوو ، هەمان لاپەڕە . دوکتۆر لەمشوێنەدا لە کتێبەکەیدا لەجیاتیی ( نووسرابێ ) نووسیویە ( نووسرابێتەوە ) . دوکتۆر هەمیشە ( نووسرابێ ) بە ( نووسرابێتەوە ) ئەنووسێ ، بەلام ئەمە هەلەیەکی ئاشکرایە . لە کوردیدا پاشگری (...ەوە) کە ئەچێتە سەر فیعل ، مەعنای دووبارەکردنەوە ئەگەیەنێ وەك ( هاتن .. هاتنەوە ، چوون .. چوونەوە .. ، کردن.. کردنەوە ) کەچی ئەم نووسینەی دوکتۆر ئەینووسێ یەکەمجارە . نووسینەوە لە کوردیدا مەعنای ( استنساخ )ی عەرەبی ئەگەیەنێ . ڕاستەکەی دوکتۆر تێکڕا لە مەیدانی ڕاگرتنی بنەڕەتەکانی ڕێزماندا بەخیلیی پێ نابرێ . لەمڕووەوە بە وردی لەو کۆپلانەی دوکتۆر وردبینەوە کە من وەریان‌ئەگرم .

شوێنپێیەکی پتەوتردا پێ دانێو لەو شوێنە خلیسکانە ڕزگاری بێ کە لەم بەرهەمەیدا هاتوونەتە ڕێی ..



بەر لـە هەرچی دوکتۆر مارف دایناوە کەوا نالی لـە ١٨٠٠ی ز دا هاتووەتە دنیاوەو لـە ١٨٥٦دا مردووە . دوکتۆر خەزنەدار بـە پێویستی نەزانیوە ، وەك ( عیلم ) بە پێویستی ئەزانێ ، بلێ ئەو سەرچاوەیە کامەیە ئەم مێژووەی لێ وەرگرتووەو چۆنی بۆ ڕاست بووەتەوە کە ڕاستە . بەر لە دوکتۆر مارف ، موحەممەد ئەمین زەکی بەگ نووسیویە کەوا نالی لـە ساڵانی ١٢١٥ ـ ١٢٧٣ی ز دا ژیاوە (٧) . لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەویش هیچ سەرچاوەیەکی بۆ ئـەم مێژووە دیاری نەکردووە ، هیچ مەرج نییە ١٢١٥ بەرابەری ١٨٠٠و ١٢٧٣ بەرابەری ١٨٥٦ بێ ، چونـکە لەوانەیە ئەگەر ڕاستیش بێ نالی لە ١٢١٥دا هاتبێتە دنیاوە و لە ١٢٧٣دا مردبێ ، ئەم دوو ڕووداوە ڕێکەوتی ١٨٠١و ١٨٥٧ بکەن چونکە هەرکام لە ساڵە کۆچییەکان بەشێك لە هەرکام لەم دوو ساڵە زایینییەیان بەرئەکەوێ . دوکتۆر کەمال فوئادیش ، وەك دوکتۆر مارف ، هەر پشتی بەم مێژووەی موحەممەد ئەمین زەکی بەگ بەستووە(٨) . تەنها مامۆستا عەلائەددین سـەجادی وتوویەتی لە ١٧٩٧دا لە دایك بووەو لە ١٨٥٥دا مردووە(٩) . ئەویش ، وەك موحەممەد

---

(٧) محمد امين زكي ، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان ( ترجمة محمد علي عوني ) ، القاهرة ، ١٩٣٦ ، ص ٣٥٨ .

(٨) کەمال فوئاد ، دەسـنووسی کوردی ، فیزبادن ، ١٩٧٠ ( بـە زمانی ئەڵمانی ) [ دوکتۆر مارف خـۆی پێشتر لەم سـەرچاوەیە ئاگاداری کردووم ] .

(٩) علاءالدين سجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، ل ٢٤٠ ـ ٢٤٤ ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧١ .

ئەمین زەکی بــەگ ، هیچ بەڵگەیەکی بــۆ ئەم ئیددیعایەی خــۆی دیاری نەکردووە .

بەڵام با چش بکەین لە سەرچاوەو بەڵگەو ، عیلم بخەینە لاوەو ، هەر بە عەقڵ لێکی‌بدەینەوە ، بزانین ئەشێ ئەم دوو ساڵە ساڵی هاتنە دنیاو کۆچی دوایی نالی بێ‌و نالی ٥٦ ساڵ ژیابێ ؟

ئەوەی عەقڵ نیشانی‌ئەدا ئەوەیە تائێستا کەسێك نی‌یە لەم‌جیهانەدا بتوانێ بڵێ نالی کەی لەدایك‌بووە ، ئەوەش تــەنها لەبەرئەوە کە نالیی مکایەلی ، ئەگەر باوکیشی جافێکی کۆچەری گەرمیان‌و کوێستان‌کەر نەبووبێ ، کوڕە فەلاحێکی ئەوپەڕەکەی گوزەران‌باشی شــارەزوور بووەو ، چ ناوجاف‌و چ شارەزووری ئــەو سەردەمەش بەدەگمەن نــەبێ خوێندەوارێکیان تیا هەڵنەکەوتووە . لــە هەموو کوردســتاندا کوڕە مــیرو مەلاو بازرگانــە گەورەکان نەبێ کە لەوانەیە باوکیان مێژووی هاتنە دنیایانیان لەپاڵ کتێبێکدا نووسیبێتەوەو مابێتەوە بۆ ئێستا ، کەسێك نەبوە بزانێ کەی لەدایك‌بووە. لەوانەیە دایــك‌و کەس‌وکارو دەرو دراوسێی کەســێك لــەیادیان بووبێ ئەوکەسە ، بۆنموونە ، لە ساڵە گرانی‌یەکەدا ، یا لە ساڵی چاوەقوولەکەدا ،یا لە ساڵی خۆرگیرانەکەدا لەدایك‌بووە . بەڵام ئەوە بەدەردی کێ ئەخوا مادەم ئەو ساڵە خۆی نازانرێ چ‌ساڵێ بووەو زانیاری‌یەکی تەنانەت لەم‌بابەتەشمان لەبارەی لەدایك‌بوونی نالی‌یەوە بەدەستەوە نی‌یە . کەواتە ئەبێ کێ بێ کاتێ کە دایکی نالی لەسەر کاسە بووە ، ئەو لەوێ بووبێ‌و مێژووی لەدایك‌بوونی نووسیبێ‌و ، لەکوێدا نووســیبێتی‌و ، کێ پاشان دیبێتی‌و ، ئێســتا ئەو سەرچاوەیە لەکوێ بێ‌و ، بۆ کەس تائێستا باســێکی نەکردووە ؟ ئــەمە لەدایك‌بوون . مردنیشی هەر هەمان دەستوور . بەڵێ ڕاستە نالی لە ژیانیا برووزی کردووەو خــەڵك لــە زۆر لا ناسیویانەو گەیشــتووەتە وڵاتێکی ئاوەدان‌و پێشــکەوتووی وەك ئەستەموڵ‌و لــەوێ مردووە ، بەڵام خۆ

تائێستا کەس سەرچاوەیەکی دەس‌نیشان نەکردووە تیا نووسرابێ نالی لە فلانە سالدا مردووە • کۆنترین مێژوویەکی ژیانی نالی ئەوەیە ئەمین فەیضی لە (ئەنجومەنی ئەدیبان)ەکەیدا نووسیویە کە ئەلێ : « چووەتە ئەستەموول•• تا نیهایەتی عومری لە ئەستەمولدا ماوەتەوە • مەدفەنی موبارەکی ئەوەتە لە ( ئوسکودار ) »[١٠] • ئەستەموولی ئەو سەردەمە لە هەر شوێنێکی کوردستان باشتر دەستی‌داوە بۆئەوە کە مێژووی مردنی ناودارێکی وەك نالیی تیا ون نەکرێ•• ئەمین فەیضی‌یش لە گەلێ‌کەس باشتر ئەوەی لەتوانادا بووە کە ئەگەر مێژووی مەرگی نالی بنووسرایە ، بیزانێ • ئەگەر بیشیزانی‌یایە ئەینووسی • هیچیش دیار نی‌یە •• کەواتە دوکتۆر مارف‌و کەسانی ( لێکۆلەرەوە )ی وەك ئەو ئەم مێژووە لەکوێ دێنن‌و پشت بە چ سەرچاوەو ( بەلگەیەکی زانستی ) ئەیخەنە سەر قاقەز ؟

لە سەرێکی‌تریشەوە گەلێ بەلگەی‌وا هەن لە شیعری نالی خۆی‌و لە شتی‌تریش ، ئەوەمان پێ ئەسەلمێنن کە نالی زۆر پیر بووە کە مردووە • دیارە ٥٦ سالیش تەمەنێك نی‌یە مرۆڤی تیا بە ( زۆر پیر ) دابنرێ • سەیرێکی ئەم بەیتانەی نالی بکەن کە ئەلێ :

**مووی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شۆرە شەط**
**شۆرە شەط یەعنی کە تێدا خود بە خود قەل بوو بە بەط**
**هەلگرا ، وەك مۆمی کافووری بە شەودا ، موو بە مووم**
**دا سیاهیی ڕوو بخوێنم نوقطە نوقطە ، خەط بە خەط**
**من دەلێم شەو بوو بە ڕۆژ ، نەفسم دەلێ ڕۆژ بوو بە شەو**
**ئەو موصیبە ، چونکە چاوی پێ سپی بوو ، من غەلەط**
**ڕەوغەنی دیدەم ڕژایە سەر کیتابی خەططی خۆم**
**چاو لە ئێشی ئەو سپی ، نووریش بەسەر ئەودا سەقەط (١١)**

---

(١٠) امین فیضی ، انجمن ادیبان کورد ، استانبول ، ربیع الاول ١٣٣٩ .

(١١) بۆ لێکدانەوەی مەعنای ئەم شیعرانە بڕوانەرە : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، دیوانی نالی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٤٢ ـ ٢٤٧ .

باشه با بڵێین نالی ئەم پارچە شیعرەی لە دواسـاڵی ژیانیدا وتووە ، بەڵام توخوا ٥٦ ساڵی‌یەك شتی‌وا ئەڵێ‌و ئەگونجێ پیاو لە ٥٦ ساڵیدا مووی وا سپی هەڵگەڕابێ‌و چاوی وا کزو کوێر بووبێ ؟

هەروەها سەیرێکی ئەم بەیتانەی بکەن کە ئەڵێ :

**ئەی تازە جەوان ! پیرم و ئوفتادەوو کەوتووم**
**تا ماوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم ، کە بەسەرچووم**
**قوربانی وەفاتم**
**تۆ یووسفی ئەوحوسنی لەسەر میصری جیهانی**
**من پیرم و فانی**
**لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم**
**هەروا بەتەماتم (١٢)**

سەیرێکی ئەم‌بەیتەش بکەن کە ئـەڵێ :

**بۆ مەمك (( نالی )) چ مندالانە وەی وەی کردووە !**
**گەرچی مووی وەك شیرە ، بەو شیرە شکۆفەی کردووە ! (١٣)**

باشه ، کێ ، بەعادەت ، لە ٥٦ ساڵیدا ، ئـەگەر دیسانەوە بڵێین نـالی ئەم شیعرانەی‌تریشی هەر لە دواساڵی ژیانیدا وتووە ، ئەوەنـدە پیر ئەبێ «ئوفتادە» بێ‌و «بکەوێ»و، پێویستی بەوە ئەبێ دەست‌بدەنە دەستی‌و خۆی بە «فانی» لە قەڵەم بدا ؟ کێ لە ٥٦ ساڵیدا مووی وەك شیر سپی ئەبێ ؟ ئەم وەزعەی نالی ئەگەر هەندێکیشی موبالەغەو زیادەڕەوی بێ ، هێشتا هەر ئەبێ نیشانەی پیری‌یەکی تەواو بێ کە لە ٥٦ساڵیدا نایەتەدی .

ئەمە هەمووی سەرەڕای ئەوە کە حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی‌زادە (باوکی جەنابی مەلای گەورەی کۆیە ) گێڕاویەتەوەو دیـارە قسەکەشی جێگای متمانەیە ، کەوا لە ساڵی ١٢٨٨ی.ك ( ١٨٧١ ــ ١٨٧٢ی.ز )دا نالیی

(١٢) بڕوانەرە : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٦٤ ــ ٢٧٠ .
(١٣) بڕوانەرە : هەمان سەرچاوە ، ل ٥٤٤ ــ ٥٤٧ .

نە مەککە دیوەو کە دیویشیە زۆر پیر بووەو ژەنگە لــە هەشــتا ســالیدا بووبێ(١٤) • هەروا سەرەڕای ئەوەش کە دوکتۆر خۆی ئەیلێ کە کونسوڵو ژۆژەلاتناسی ڕووس خۆدزکۆ لە ١٨٥٣دا لە پاریس چاوی بە ئەحمەد خان ناوێك کەوتووە خەڵکی سلێمانی بووەو لە ئەســتەمووڵەوە چووە بــۆ ئەورووپا • ئەم خۆدزکۆیە هەواڵی شــاعیریەتیی نالیی لــەو ئەحمەد خانە بیستووە (١٥) • دیارە ئــەبێ نالی لەم سەردەمەدا لە شــام بووبێ چونکە شیعرەکەی کە لەپاش تێکچوونی میرنشینیی بابان بۆ سالمی ناردووە بــۆ سلێمانی ، لە شامەوە ناردوویە • لەولاشەوە هەموان هاودەنگن لەوەدا کە نالیو ئەحمەد پاشا ماوەیەکی زۆریان پێکەوە لە ئەستەمووڵ ڕابواردووە • جا ئەگەر نالی لــە دەوروبەری ١٨٥٣دا لە شام بووبێو پاشــان چووبێتە ئەستەمووڵو مــاوەیەکی زۆری لەوێ ڕابواردبێ ، کەچی لــە ١٨٥٦یشدا مردبێ ، ئەوە دیارە هەڵەیەك لە مەسەلەکەدا هەیە چونکە ســێ ساڵ بەشی چوونی نالی لە شامەوە بۆ ئەســتەمووڵو گەڕانەوەی ئەحمەد خان بــۆ ئــەوێو ژیانێکی دوورو درێژیــان لەوێ پێــکەوە نــاکا ، لەبــەرئەوە کە میرنشینیی بابان لە ١٨٥١دا تێکچووەو ئەحمەد پاشای دوامیری بابان [ کە دیارە ئەبێ ئەحمەد خانەکەی خەڵکی سلێمانیی لەمــەڕ خۆدزکۆ بێ ] پاش ڕووخانی میرنشینیی‌یەکەی پەنای بردووەتە تارانو شای قاجار تکای لای سوڵتانی ئەستەمووڵ بۆ کردووە کە لێی ببوورێو ئەویش لەسەر تکای ئەم لێی بووردووەو ئەنجا ئەحمەد پاشا چووە بۆ ئەستەمووڵ • جا کە ئەحمەد پاشا لە ١٨٥٣دا لە پاریس خۆدزکۆی دیبێ ، ئــەوە دیارە ئەوەندە لــە

---

(١٤) بڕوانەرە : مەسعوود موحەممەد ، چەپکێك لە گوڵزاری نالی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل چلو پێنج .

(١٥) بڕوانەرە : محمدی مەلاکریم ، بەرهەمی ئەم چەند ساڵەی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردو پلانێك بۆ لەمەوپاشمان ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٤)ی ساڵی (٢) ، حوزەیرانی ١٩٧٣ .

ئەستەمووڵ نەماوەتەوە چووە بۆ پاریس‌و پاشان سەرلەنوێ لەوێوە گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەمووڵ‌و ماوەیەکی زۆر لەوێ لەگەڵ نالی ژیاوە کە ئەویش لەو سەردەمانەدا لە شامەوە چووە بۆ ئەستەمووڵ ، چونکە ئەو دوو ساڵەی نێوان ١٨٥١ و ١٨٥٣ هەر بەشی ئەو پەنابردنە تارانەی ئەحمەد پاشاو تکابۆکردنەی شای ئێران لای سوڵتانی ئەستەمووڵ‌و بەتکاکردنەکەی ئەم‌و چوونی ئەحمەد پاشا بۆ ئەستەمووڵ‌و بۆ پاریس ـ ئەکا ، ئەویش بەحاڵ • کەواتە ئەبێ چوونی نالی بۆ ئەستەمووڵ پاش گەڕانەوەی ئەحمەد پاشا لە پاریس یا هیچ نەبێ پاش چوونی بووبێ لە ئەستەمووڵەوە بۆ پاریس‌و پاش ئەوە ماوەیەکی زۆریان پێکەوە لە ئەستەمووڵ ڕابواردبێ ، کە ئەمەش لەگەڵ ئەوە ڕێك‌ناکەوێ کە نالی لە ١٨٥٦دا مردبێ [١٦] •

کەواتە وا بەڕوونی دەرکەوت کەس نازانێ نالی کەی هاتووەتە دنیاوەو ڕێیشی‌تێ‌ناچێ بە ٥٦ ساڵی مردبێ‌و لە ١٨٥٦یشدا مردبێ ••



هەر لەو باسەی مێژووی ژیانی نالیدا ؛ دوکتۆر مارف خەزنەدار ئەڵێ نالی « لەپێش ڕووخاندنی میرنشینیی سلێمانی ، وڵاتی بەجێ‌هێشتووەو چووە بۆ حەج » •

ڕاستە نالی حەجی کردووە • ئەمە لە ڕێگای هەندێ پارچە شیعری خۆیەوە دیارو ئاشکرایە ، بەڵام کەی وڵاتی بەجێ‌هێشتووەو کەی چووە بۆ حەج ، ئەوە تائێستا بۆ کەس ڕاست نەکراوەتەوە • ئێمە لە ڕێگای شیعرەکانی نالی خۆیەوە هەر ئەوەندەمان بۆ دەرئەکەوێ کە نالی بە پیری

---

(١٦) بە ڕای من گەڕانێکی ورد بە کتێبخانەکانی مەککەو مەدینەو شامدا ، سەرەڕای کتێبخانەکانی ئەستەمووڵ ، لەوانەیە ببێ بە هۆی زانینی گەلێ شتی نەزانراو لەبارەی نالی‌یەوە .

حەجی کردووە ، وەك لەو پارچە شیعرەیدا دەرئەکەوێ کە لــە سەفەری حەجیدا لەسەر قەبری پێغەمبەر ( د.خ ) وتوویەتی‌و تیا ئەڵێ :

**ئەی تازە جەوان ! پیرم‌و ئوێتادەوو کەوتووم**
**تا ماوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم ، کە بەسەرچووم**
**قوربانی وەفاتم**

تا ئــەڵێ :

**موددێکە کە هەم‌گەردشی دەورانی سوپیهرم**
**موغبەڕ بووە میهرم**
**ئاوێنەیی دڵ شاهیدە هەرچەندە سییەهـ‌ڕووم**
**میرئاتی جەلاتم (١٧)**

هەروا لە شیعری نالی خۆیدا نیشــانەی ئەوەش هەیە کە لە حەجەوە چووە بۆ شام‌و ئەستەموڵ ، وەك ئەوە کە ئەڵێ :

**وەی کە ڕووزەردی مەدینە و ڕووسیاهی مەککە خۆم !**
**دەرکراوو دەربەدەر ، یاڕەب دەخیلی عەفوی تۆم !**
**دەفتەری ئەعمالی من ، بێ قەطرەیێکی ڕەحمەتت**
**کەی بە صەد زەمزەم سیاهیی نوقطەیێکی لێ دەشۆم ؟!**
**کەعبە ئیشراقی وەکوو خورشیدە ، من چاوم ضەعیف**
**لێم بووە ڕۆشن کە بوعدی قوربە ، قوربی بوعدە بۆم**
**بۆ جیواری حەق ، لە هەر جێ صیدقی نییەت کافی‌یە**
**من لە ( بیت الله ) ئینشەڵلا ( باذن الله ) دەڕۆم**
**لێم حەرامە دانەوو ئاوی حەماماتی حەرەم**
**من کە بازی دیدە بازم نەك شەوارەی دەستەمۆم**
**تا بە کەی وەك ڕاوییەو وەك سانییەی سێ‌پەل شکاو**
**بێ‌طەوافـو سەعی‌و عەمرە هەر بخەوم‌و هەر بخۆم**
**من لەوانەم چی کەوا ئەهلی وەسیلەو مەسئەلەن**
**عامیل‌و ناچارو مەعذوور ئەر بلێن هەر بێنە بۆم**

---

(١٧) بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی ژمارە ١٢ .

خەوفی من لێرە لەبەر زۆریی گوناهە یەك بە صەد
گەرچی عاصیو مونئیبم ، ئەمما موقیرّو بێدرۆم

شادمانی بێوەفایە ، یاری تێری مەستییە
یاری تەنگانەم غەمە ، با هەر غەمی خۆم خۆم بخۆم

لامەدە « نالی » لە ئەنباری جیرایەی صالحان
گەرچی ببیە خۆشەچینی دانەیی خەرمانی ڕۆم ..(١٨)

بەلکو نیشانەی ئەوەش هەیە کە لە وەزعی کوردستان بێزار بووە ، بەجێی‌هێشتووە و لەوێوە چووە بۆ حەجو ئەوەش لە ئاخری عومریدا بووە، وەك ئەوە کە ئـەڵێ :

ئەلا ئەی نەفسی بوومئاسا ، هەتا کەی حیرصی وێرانە
لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ ئازانە ، بازانە !

موسوڵمان ! لێرە مانی خانو مانت هەر نەمان دێنێ
پەشیمان بە کە دەرمانی نەمانت مایەی ئیمانە

بلا بۆ کونەبوو بێ ، مفتی مشكو ماری کەندوو بێ
خەطیرەی گەنجی وێرانە ، ذەخیرەی کونجی کاشانە

بەقییەی عومری ضایع گەر مورادت پێ تەدارەك بێ
حەیاتی مەککەتو مەوتی مەدینەت جەبری نوقصانە ..(١٩)

تا دوایی .

ئێمە ئەتوانین ئەم بەیتانە کە نیشانەی بێزاریی نالین لە باری ئەوڕۆژەی وڵاتەکەی ، بێیانکەین بە بەڵگەی ئەوە کە لـەپاش ڕووخانی میرنشینیی بابانەکان کوردســتانی بەجێ‌هێشتووەو مەبەســتی لە وێرانە وڵاتەکەیو ، لە کوندەبوو ئەوکەسانەیە کە ڕازی بوون بە سەرشۆڕی لەژێر ســایەی عوسمانییەکاندا بژین ..

---

(١٨) بڕوانەرە : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، ســەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٩٩ ـ ٣٠٤ .

(١٩) بڕوانەرە : سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٨٢ ـ ٥٢٠ .

نیشانەیەکیتریش هەیە کەوا نالی لەتاو ستەمکاران ، کە دیارە ئەبێ هەر عوسمانییەکان بن ، وڵاتی بەجێهێشتووە • ئەو نیشانەیەش ئـەوەتە کە ئەڵێ :

**سوی مصراست مرا عزم از این لجهء غم**
**تا که در نیل کشم جامه ز بی‌داد و ستم**

واتە : نیازی ئەوەم هەیە خۆم لەم گێژاوی خەمە دەربازکەمو بڕۆم بۆ میسر ، تا بۆ دەربڕینی بێزاریو نارەزایی لە جەورو ستەم کراسەکەی خـۆم لە ئاوی نیل هەڵکێشم •

جا ئەبێ ئەم جەورو ستەمـە کە نـالی لە دەستی هەڵدێ ، لە جەورو ستەمی عوسمانییەکان بەولاوە چی بێ کە سولەیمانییان داگیر کردبوو ؟

دەس‌نیشانکردنی میسریش بۆ بۆچوون ، نیشانەیەکیتری ڕاسـتیی ئەم بۆچوونەی ئێمەیە ، چونکە میسری ئەو سەردەمە تاقە وڵاتێکی سوننی مەذهەبی موسوڵمانان بووە سەری بۆ عوسمانییەکان نەخەواندبێو لێیان یاخی بووبێ •

جا ئەگەر ئـەم لێکدانەوەو بەراوردکردنانەی من ، کە لـە چـاپی نالییەکەی خۆیشماندا زۆریمان وتووە ، ڕاست بن ، ئەوا دیارە نالی پاش ڕووخانی میرنشینیی بابانەکان سـلێمانیی بەجێهێشتووەو ، بـە پیرییش بەجێی هێشتووەو ، پێشانیش چووە بۆ حەجو زیارەتی قەبری پێغەمبەرو ، بەڵکو نیشانەی ئەوەش ئەبن کە گەلێ بەر لە ١٨٠٠ لەدایکبووە •



دوکتۆر مارف خەزنەدار لە باسی « مێژووی بڵاوکردنەوەی شیعری نالی »دا ئەڵێ : « هەر لێکۆڵینەوەیەك لەبابەت نالیو شیعرەکانیەوە دەبێ لە ڕووی هەموو چاپەکانی دیوانیەوە بێ » • ڕاستەکەی ، وەك دوکتۆر خۆیشی

ڕەخنەی لە هەموو چاپەکانی [ پێش چاپەکەی ئێمەی ] دیوانی نالی گرتووە، ڕاستکردنەوەی ڕاستەقینەی شیعری نالی ( نەك نالی خۆی ! ) ئەبێ بەر لە هەرچی لەسەر بناغەی بەراورد کردنی دەستنووسەکان بێ ، چونکە ئەو دەستنووسانە هەرچۆن بن بە شێوە نووسینی سەردەمی نالی نووسراونەتەوەو ، چاپەکان کەمو زۆر ڕێنووسی کۆنیان تیا دەسکاری کراوە ، گوایە هێنراونەتە سەر ڕێنووسی نوێ • جا کە ئەوەشمان زانی لەوانەیە نوسخەکانی بەردەستی خاوەن چاپەکان خۆیان هەڵەی زۆریان تیا بووبێ ، بۆمان دەرئەکەوێ ئەو نووسەرانە بەوەو بەو گۆڕینەی بەسەر ڕێنووسی دەسنووسەکانیاندا هێناوە ، هەڵەکانیان دووبادکردووەتەوە • کەواتە بۆ ڕاستکردنەوەی دیوانی نالی یا هەر دیوانێکی کلاسیکی ، ئەبێ پشت بە دەستنووسە کۆنەکان ببەسترێو کەڵکیش لە چاپەکان وەربگیرێ• بەڵام دیارە بۆ کەسانێ کە شارەزای ڕێنووسی فارسی ئامێزی کۆن نەبن ، خوێندنەوەی چاپەکان ئاسانترە • بۆیە ئەو جۆرە کەسانە پشت بەو نوسخە چاپییانە ئەبەستنو باسی دەستنووس هەر بۆ وەزنی شیعر دێننە کایەوە • جا ڕەنگە دوکتۆریش هەر لەمڕووەوە ئەو ڕایەی هەبێ وەکوو لەمەولاش بۆمان دەرئەکەوێ •



دوکتۆر هەر لەم باسەدا ئەڵێ : « دەبێ ئەوەش لەبیرنەکەین کە هەموو ئەو شیعرانەی بە ناوی نالییەوە تۆمار کراونو لە چاپەکانی دیوانی خۆیو (لە) ڕۆژنامەو کۆوارەکاندا چاپکراون ، وەنەبێ هەموویان هیی ئەو بن » • ئەنجا ئەڵێ : « دیارە ئێرە جێگەی ئەوە نییە بە لێکۆڵینەوەو بەڵگە پیشاندان ئەو شیعرانە دەستنیشان بکرێن ، چونکە ئەمە زۆردەکێشێ•• تەنیا ئەوەندە هەیە پاش لێکۆڵینەوەیەکی قووڵو هەوڵدانێکی دوورو درێژ ، هەموو ئەو

شیعرانەمان لەم دیوانە دوورخستەوە کە بە باوەڕی ئێمە هیچ پێوەندی یەکیان بەسەر نالی یەوە نی یە » •••

منیش ئەمەوێ بڵێم ئەگەر (ئێرە) جێگەی لێکۆڵینەوەو بەڵگە پیشاندان نەبێ بۆ بابەتێکی وا بایەخدار کە پێوەندی بە شیعری نالی یەوە هەیەو ، دیوانەکەش دیوانی نالی یە ، ئەی ئەبێ کوێ جێی بێ ؟ کوێ لە دیوانی نالی خۆی شایانترە بەو بەڵگە پیشاندانو لێکۆڵینەوەیە ؟ ئەنجا لە ( علم )دا کەی ترسی (زۆرکێشان) کراوە بە پاساودەری لێ نەکۆڵینەوەو بەڵگە پیشان نەدان؟ زیاد لەوەش ئێمەی خوێندەوار چۆن بەم « لێکۆڵینەوەی قووڵو هەولدانی دوورو درێژ»ەی دوکتۆر بزانینو ، بە چیدا بۆمان دەرکەوێ کە «باوەڕ»ەکەی ئەو لەجێی خۆیدایەتیو ئەو شیعرانەی ئەو ئەڵێ هیی نالی نین ، ڕاستە هیی نالی نین ؟



لە باسی « نالیو شیعری لای خۆمانو لە ڕۆژهەڵاتدا »یشدا دوکتۆر مارف خەزنەدار تێکستی ئەو سەرگوزەشتەیەی نالیی بڵاوکردووەتەوە کە ئەمین فەیضی لە (ئەنجومەنی ئەدیبان)ەکەیدا نووسیویە ، کە سەبارەت بەوەی یەکەمین کەسە لەبارەی نالی یەوە نووسیبێتی ، گەلێ شتی بەنرخی تیایە • کەچی هەر خۆی پاش چەند دێڕ ئەڵێ : « گرنگترینو کۆنترین سەرچاوە لەبارەی ژیانی نالی یەوە پێشەکیی چاپی یەکەمی دیوانەکەیەتی » •

ئێمە لەوانەیە بتوانین بڵێین ئەو زانستی یانەی لە پێشەکیی چاپی یەکەمی دیوانی نالیدا بڵاوکراونەتەوە، بایەخدارترین زانستین، چونکە بابەتی زۆرتریان لەوەی ئەمین فەیضی تیایە ، بەڵام دیارە کۆنتر نین • تەنانەت هەر دوکتۆر خۆی ، چەند دێڕێك پێش ئەم نووسراوەی ، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی تێکستەکەی ئەمین فەیضی دا نووسیبووی ئەم پیاوە ئەو شتەی لە ١٩٢٠دا

بلاوکردووەتەوەو [٢٠] ؛ لە پەراوێزی باســی چاپی یەکەمی دیوانەکەشدا نووسیویە کە لە ١٩٣١دا لــە بەغدا لەچاپدراوە .. ئیتر چۆن ئەوەی لــە پێشەکیی دیوانەکەیدا نووسراوە کۆنترین زانستییە ؟ کێ بێ نەزانێ ١٩٢٠ لەپێش ١٩٣١ەوەیە ؟!



کە باسی وتارەکەی پیرەمێردیش ئەکا کە لە ( ژیان )ی ژمارە ٢٩٣ی ١٤ی ئەیلوولی ١٩٣١دا لەبارەی چاپی کوردیو مەریوانیی دیوانی نالییەوە بلاوی کردووەتەوە ، لە پەراوێزەکەیدا ئیشارەت بۆ ئەوە ئەکا کە منیش ئەو وتــارەم لــە ژمــارە ٣٥ی گۆڤــاری ( بــەیان )ی نیســـانی ١٩٧٦دا بلاوکردووەتەوە [٢١] . ئەمە بە هەموو ئاشکراییەك وائەگەیەنێ دوکتۆر بەڕاستی نەبوە کە مێژووی ١ی نیسانی ١٩٧٥ی بۆ نووسینی ئەو بابەتانە داناوەو کە پاشانیش ئەڵێ لەم مێژووەدا لە هەمووشتێ بووەتەوە . کەواتە ئەی لەبەرچی لەگەڵ باسی چاپەکانی دیوانی نالیدا تاقە دێڕێکیشی لەبابەتی چاپەکەی ئێمەوە نەنووســیوە ؟ تۆ بلێیی لای‌وابووبێ بــەو ناونەهێنانو مێژووگۆڕینە ( خۆبەخۆ بەدرۆدا خستووەوە ) ئەتوانێ کارەکەی ئێمە لە مێژووی چاپەمەنیی کوردیو لێکۆڵینەوەی نالیدا بسڕێتەوە ؟ خــۆ ئەگەر بیشڵێ ئەو پەراوێزەی لەکاتی ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپدا نووسیوە، ئەوا

---

(٢٠) لە کتێبەکەی ئەمین فەیضی خۆیدا نووسراوە : ربیع الاول ١٣٣٩ . ئەم مێژووە ڕێکەوتی تەشرینی دووهەمو کانوونی یەکەمی ١٩٢٠ ئەکا .

(٢١) لام‌وایە دوکتۆر لــە ڕێی منەوە بەو وتارەی پیرەمێردی زانیوەو خــۆی پێشــتر ئاگای لێ نەبوە . ئیشــارەت‌کردنەکەشی بۆ ئەوە کە من ئــەو وتارەم دووبارە بلاوکردووەتەوە ، بەڵگەی ئەمەیە ، ئەگینا قازانجی ئەو لەوەدابوو ئەو ئیشــارەتە نەکاو ئەو گیروگرفتە بــۆ خۆی نەخولقێنێ کە چۆن لە بابەتێکی لەوەپێــش نووســراودا باســی ڕووداوێکی لەوەپاش ڕووداو ئەکا .

منیش ئەڵێم ئەی نەئەشیا لە پەراوێزێکیتریشا هیچ نەبێ تەنها باسی دەرچوونی چاپەکەی ئێمەش بکاو بیخاتە ڕیزی چاپەکانیترەوە! بەڵام ڕاستیی مەسەلەکە ئەوەیە سەرەتاکە تێکڕا لەپاش دەرچوونی چاپەکەی ئێمە نووسراوەو دوکتۆر بەدەسەنقەست باسی ئەوەی ئێمەی نەکردووەو ، ئیشارەتکردنەکەی هەر لەم باسەدا بۆ هەندێ وتاری خۆی لەبارەی نالییەوە کە لە تەشرینی یەکەمو دووهەمی ١٩٧٥و کانوونی دووهەمو شوباتو مارتی ١٩٧٦ی گۆڤاری ( ڕۆژی کوردستان )و تەشرینی دووهەمی ١٩٧٥ی گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ )دا بڵاوی کردوونەتەوە ، هەموو ڕێتێچوونێکی نووسینی سەرەتاکەی بەر لە بڵاوکردنەوەی چاپەکەی ئێمە هەڵئەوەشێنێتەوەو ، ئەم کردارەی دوکتۆر ئەکا بە کردارێکیوا بە هیچ کلۆجێ لە دادگای ئەدەبدا چاوی لێ نەپۆشرێ ..



دوکتۆر خەزنەدار کە لەم باسەدا دێتە سەر وتارەکەی مامۆستا گۆران لە لاواندنەوەی پیرەمێرددا ، ئەوەی کە بەراوردی پیرەمێردو نالیی تیا کردووە ، ئەڵێ : « ئەم تێبینییانەی گۆران وەکو شتێکی بەجێو پەسند خۆیان دەنوێنن » ئەنجا گورج دوابەدوای ئەوە ئەشڵێ : « بە لای ئێمەوە وێنەیەکی زیاتر هونەرییە بۆ بەراوردکردن لەنێوان نالیو پیرەمێردو هەڵسەنگاندنی شیعری نالی لەوەی زانستی بێ ، لەبەرئەوەیە ئێمە بیرو ڕایترمان هەیە لەمبابەتەوە لە لێکۆڵینەوەی تایبەتیماندا لەبارەی نالییەوە دەریدەبڕین » .

لێرەشدا ، وەك لە باسی ئەو شیعرانەدا کە دراونەتە پاڵ نالیو دوکتۆر ئەڵێ هیی نالی نین، من لاموایە ئەبوو دوکتۆر چەردەیەك لەو باری سەرنجەی خۆی دەرخاو ، جا ئەگەر پاشان وەك خۆی ئەڵێ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیی

لەبارەی شیعری نالی‌یەوە نووسی ، زیاتر درێژەی بداتێو باشترو گوشادتر ئەو باری سەرنجەی ڕوون بکاتەوە • ئەمەی ئێستا کتێبێکە حازرو بازرو بەدەستەوەو تەرخانە بۆ نالی‌و شیعری نالی • ڕایەکەی گۆرانیش لەبارەی نالی‌یەوەیەو دوکتۆر لای‌وایە ڕایەکی زانستی‌یانە نی‌یـە • کەواتە ئەگەر شتێکی لایە بۆ لێرەدا نایڵێ‌و بۆ دوای‌ئەخا بۆ دەرفەتێکی‌تر ، کە خوا ئەزانێ بۆی ئەلوێ یا نە ؟ • ڕاستەکەی من لەوباوەڕەدام دوکتۆر بە مافی خۆیـی ئەزانێ لە هەموو دیزەیەکی ئەدەبی کورددا ئەسکوێ بێ‌و ، ئەوە بەلایەوە بایەخی نی‌یە ئاخۆ بەڕاستی ئەسکوێ‌یەتیی پێ ئەکرێ یا نە ، ئـەگینا ئەی بۆچی کە سەرە دێتە سەر باسی مامۆستا عەلائەددین سەججادی ، نایبوێرێ‌و دوای‌ناخا بۆ ئەو لێکۆڵینەوە چاوەڕوانی کراوەو ، دەس‌بەجێ پێوەی ئەدا ؟!



دوکتۆر مارف کە لەم‌باسەیدا ڕەخنە لە بیرو ڕاکانی مامۆستا عەلائەددین سەججادی ئەگرێ ئەوەی لەیادئەچێ کە ( عالم دەبێ متواضع بێ ) • بەرابەر بە کەسێکی وەك مامۆستای سەججادی کە لە پێشەنگەکانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردە لە عێراقدا ، گوێ بەوە نادا کە ڕەخنە نابێ بریتی بێ لە تیرو توانج‌و قسەی تاڵ‌و سوێری بەناهەق ، ڕستەی وەك « بە بێ‌ئەوەی زانایانەو وشـیارانە لێ‌یان ورد بێتـەوە » بـەکاردێنێ • دیـارە مامۆسـتایەتیی سەججادی نابێ بـە هیچ کلۆجێ وابگەیەنێ کە کەسـ مافی ئەوەی نی‌یە ڕەخنەی لێ بگرێ • بەپێچەوانەوە • بەڵام ئەم شێوەی لەخۆبایی‌بوون‌و فیزو خەڵك بە سووك زانینە لەپای چی‌و ، کەی شێوەی ( عالم )ەو ، لە چیدا لەگەڵ ( ڕەخنەی زانستی ) یەك‌ئەگرێتەوە ؟

دوکتۆر خەزنەدار کە ڕەخنە لە سەججادی ئەگرێ ئەڵێ : « لە کتێبی ( ئەدەبی کوردی‌و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیدا ) ••• ڕێچکەی بەلاغەی

عەرەبیی بۆ ئەم مەبەسە وەرگرتووە • ئەمەش وەنەبێ کارێکی زۆر بەجێ بێ بۆ تێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی » •

بەلاغە یا ڕەوانبێژی ، وەك زانستێك ، هەرچەند بەش بەحاڵی ئەدەبی گەلە موسوڵمانەکان تێکڕا بەسەر ئەدەبی عەرەبدا پراکتیکە کراوەو زاناکانی ئەم گەلانە لەم مەیدانەدا خۆیان لەگەڵ ئەدەبی عەرەب خەریك کردووە ، نابێ ئەمە ئەو ڕاستییەمان لەبیربباتەوە کە گەلێ قانوون و پێڕەوی گشتیی شی هەیە ئەکرێ بە باڵای هەموو ئەدەبێك ببڕێ • مەجاز ، کینایە ، تەشبیە ، ئیستیعارە ، هونەرەکانی بەدیع و گەلێکی تر لە بابەتەکانی بەلاغە لە هەموو زمانێکدا هەن و بەکارئەهێنرێن •• ئەوەندە هەیە ئەبێ وریای ئەوە بین بە جۆرێکی وا بەسەر بابەتەکانی زمانی خۆمانیاندا پراکتیکە بکەین خاسیەتەکانی ئەدەبەکەمانمان لەیاد نەچێتەوەو ، نموونەیان لە ناوجەرگەی ئەدەبەکەی خۆمانەوە بۆ بهێنینەوە • ئەم زانستی بەلاغەی عەرەبییە کە ئێستا لە قوتابخانەکاندا ئەخوێنرێ و پێشانیش لە حوجرەکانی مەلاو فەقێدا باو بووە، گەلێ قانوونی گشتیی وای تیایە ئەکرێ بۆ شیکردنەوەی تێکستی ئەدەبی لە هەر زمانێکی تردا بەکاربهێنرێ • زانایانی ئیسلامیش هەر وایان کردووە لەگەڵ ئەدەبی عەرەبداو ، سەرچاوەی بەلاغەی عەرەبییش لە کریتیکی یۆنانییەوە هاتووە •• من ناڵێم مامۆستا عەلائەددین لە بەکارهێنانی بەلاغەی عەرەبیدا بۆ ئەدەبی کوردی توانیویە ڕچەیەکی ڕەسەنی کوردانە بگرێتەبەر، بەڵام لەجیاتیی ڕەخنەگرتن لەو کە هەنگاوێکی لەم مەیدانەدا بۆپێشەوە ناوە باشتر ئەوەیە ڕەخنەگران هەوڵی نووسینی بابەتێ بدەن ئەوەی تیا ڕوون بکەنەوە بۆمان کە بەلاغەی کوردی چۆن ئەبێ و قانوونەکانی کامەن تا بەسەر تێکستێکی کوردییاندا پراکتیکە بکەین •



دوکتۆر مارف هەر لەم باسەدا هەندێ ڕەخنەی ئاراستەی مامۆستا مەسعوود موحەممەدیش کردووە کەوا کەمتر لە ٦٠ دێڕ شیعری لە ١٩٥ لاپەڕەدا لێك‌داوەتەوەو ، تەرخان کردنی ١٩٥ لاپەڕەی بۆ لێکدانەوەی کەمتر لە ٦٠ دێڕ بەلاوە گەلێك زۆرە.. هەروا ڕەخنەی ئەوەشی لێ گرتووە کە « زۆربەی قسەکانی لە دوورو نزیکەوە بە هیچ جۆرێ هەر پێوەندی‌یان بە نالی‌یەوە نی‌یە » . لەبارەی ئوسلووبیشەوە ڕەخنەی ئەوەی لێ گرتووە کە کارێکی‌وای کردووە لە زۆر جێگەدا « لێکۆڵینەوەو ڕوون‌کردنەوەکانی پێویستی‌یان بە لێکۆڵینەوەو ڕوون‌کردنەوە بێ » . هەروەها ڕەخنەی ئەوەشی لێ گرتووە کە ناوی کتێبەکەی ، واتە « چەپکێك لە گوڵزاری نالی » ، ناوێکی نازانستی‌و دوور لە لێکۆڵینەوەو ڕۆمانتیکی‌یانەیە .

من لە وەڵامی ئەم ڕەخنانەدا ئەوەندە ئەڵێم ئەگەر وەك دوکتۆر ئەڵێ زوربەی قسەکانی مامۆستا مەسعوود موحەممەد لە دوورو نزیکەوە پێوەندی‌یەکیان بە نالی‌یەوە نەبێ ، ئەوا دیارە لە ١٩٥ لاپەڕەکەی کتێبەکەی زۆر کەمی مایەوە بۆ لێکۆڵینەوەی ٦٠ دێڕە بەیتەکە ، واتە لەوانەیە هەر ئەوەندەی بۆ مابێتەوە کە پێویستی بێ‌و ، بەم‌جۆرە ڕەخنەکەی دوکتۆر سەری تیا ئەچێ . مەسەلەی گرانی‌و ئاسانیی هەر بابەتێکیش مەسەلەیەکی موطڵەق نی‌یەو نیسبی‌یەو لەوانەیە ئەوەی بۆ دوکتۆر ئاسانە بۆ کەسێکی‌تر گران بێ‌و بەپێچەوانەوەش .. جا نازانم دوکتۆر ئەو گرانی‌و ئاسانی‌یەی بەش‌بەحالی خۆی ڕەچاو کردووە یا بەش‌بەحالی کێ ! . سەبارەت بەوەش کە ناوی ڕۆمانتیکی‌یانە بۆ بابەتی زانستی دەس‌نادا ، لام‌وایە دوکتۆر لەوەدا بۆی نەچوە کە ڕۆمانتیکی‌یەت‌و زانستی لێك جوێ‌کردووەتەوە ، چونکە ڕۆمانتیکی‌یەت خۆی بابەتێکە لە بابەتەکانی ئەدەب‌و ئەدەب خۆیشی یەکێکە لە زانستەکان . ئەوە نی‌یە دوکتۆر خۆی خوێندنی بەرزی لە ئەنستیتووتێکی ئەدەبیی سەر بە ئەکادیمیای زانستەکانی یەکێتیی سۆڤیەت تەواوکردووە ؟

ڕەخنەکەی دوکتۆر مارف لە کتێبەکەی مامۆستا مەسعوود موحەممەد کە لە هاوینی ١٩٧٦دا دەرچووە ، لەکاتێکا کە ڕەخنەکە ، وەك دوکتۆر خۆی ئەڵێ ، لە ١ی نیسانی ١٩٧٥دا نووسراوە . دیسانەوە مەسەلەی ڕاستیو ناڕاستیی ئەو مێژووە دێنێتەوە ئاراوە کە دوکتۆر لە داوێنی سەرەتای کتێبەکەیەوە نووسیویە ، کە ئەوەش بەڵگەیەکی گەورەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو قسەیەی دوکتۆرە کە لە پاشەکییەکەیدا نووسیویە گوایە بە هیچ جۆرێ کەڵکی لە نالییەکەی ئێمە وەرنەگرتووەو کتێبەکەی ئێمە نەبوە بە سەرچاوە بۆی • هەروەها بەڵگەی ئەوەشە کە سەرەتای کتێبەکەشی لە ١ی نیسانی ١٩٧٥دا نەنووسیوە •



وەك پێشتر باسمانکرد دوکتۆر مارف لە باسی «مێژووی بڵاوکردنەوەی شیعری نالی »دا وتی « هەر لێکۆڵینەوەیەك لەبابەت نالیو شیعرەکانیەوە دەبێ لەڕووی هەموو چاپەکانی دیوانییەوە بێ » • ئێمە لەبارەی ئەم ڕایەی دوکتۆرەوە دواینو باری ڕاستی مەسەلەکەمان خستەڕوو • وا دوکتۆر خۆیشی پاش چەند لاپەڕەیەك سەر لەنوێ ئەگەڕێتەوە سەر ئەم باسەو ، سەرباسی « دیوانی دەسنووسو بەیازو دەفتەری شیعری کۆنو دیوانی چاپکراوی نالی بنجی ئەم چاپەن » دائەنێ • دیارە شێوەی ڕاست ئەوەیە دوکتۆر لێرەدا کردوویەتیو زۆر باشی کردووە وا گورج ئەو هەڵەیەی پێشووی ڕاستکردووەتەوە •• من ناپرسم بۆچی پێشان دوکتۆر دەرکی بەمڕاستییە نەکرد ، بەڵام بۆم هەیە بڵێم مادەم لێرەدا بە هەڵەی خۆی زانی، بۆچی ئەوەی پێشەوەی هەر بەجارێ لانەبرد ؟ خۆ وەنەبێ هەر جاری لاپەڕەیەکی ئەم پێشەکییەی دابێ بە « دەزگای ڕۆشنبیری » تا نەتوانێ ئەوەی پێشووی دەسکاری بکاو ڕاستی بکاتەوە ؟



دوکتۆر هەر لەم‌باسەدا ئەڵێ : « بۆ ئامادەکردنی ئەم چاپەی دیوانی نالی هەموو ئەو سەرچاوەو کەرەستانەی لای خوارەوە بە وردیو قووڵی لێیان کۆڵراوەتەوەو ساغ‌کراونەتەوە ، ئنجا هوشیارانە وەرگیراون و لەم چاپەدا خۆیان نوواندووە » • جا ناوی ٤ چاپی دیوانی نالیو ١٣ سەرچاوەی دەســنووس دێنێ •• بــەڵام نە وتوویــە چــۆن « بــە وردیو قووڵی لێیان‌کۆڵراوەتەوەو ساغ‌کراونەتەوەو ، ئنجا هوشیارانە وەرگیراون »و نە بە باشیی‌یش لە سەرچاوە دەسنووسەکان دواوە •

ئاشکرایە ڕاستکردنەوەی ڕاستەقینە بەوە ئەڵێن [ دیارە دوکتۆریش ئەمە زۆر باشــ ئەزانێ ] لێکۆڵەرەوە ، هــەر وشە یا ڕستەیەکی کام لــە نوسخەکانی بەلاوە ڕاستترە بیکا بە (مەتن)و تێکستی نوسخەکانی‌تر لەگەڵ هێنانی ناوی نوسخەکانیشدا لە پەراوێزدا دانێ ، تا ئەگەر خۆیشــی نەڵێ بۆچی ئەوەیانی بە ڕاست زانیوە کە خستوویەتیە مەتنەوە ، خوێندەواری لێهاتوو خۆی هۆی بەڕاســت زانینەکەی لێکۆڵەرەوەکە بدۆزێتەوە ، یا هیچ نەبێ بتوانێ بیێ بە سەرپشكو ڕایەکی‌تر دەربېڕێ • بــەڵام دوکتۆر مارف وای‌نەکردووە • تەنها بە ڕای خۆی نوســخەیەکی هەڵبژاردووە کە زیاتر نوسخە چاپەکەی عەلی موقبیلی سنەیی‌یەو ، جیاوازیی نوسخەکانی‌تری خستووەتە لاوە ، مەگەر وەك خۆی ئەڵێ جیاوازیی نوسخەی‌تریش لەوانەبێ [ ئەویش بە ڕای دوکتۆر خۆیو بێ هیچ جۆرە بەشدارکردنێکی خوێندەوار لە ڕادانا ] هیی نالی بێ • ئەوە لەوحاڵەدا ئەو جیاوازی‌یەشی لەگەڵ تەواوی بەیتەکەدا [ کە هیچ پێویست بەوە نی‌یــە ] لە پەراوێزەوە نووسیوەتەوە ، بێ‌ئەوەش بڵێ ئەم جۆرە هیی کام نوسخەیە • ئەم کارەی دوکتۆر کردوویەو بۆ خۆی بە « ورد »و « قووڵ »و « هوشیارانە »ی دائەنێ ، نەك هەر وردو قووڵو هوشیارانە نی‌یە ، بەڵکو لە جیهانی تۆژینەوەدا بــە لێکۆڵینەوەش دانانرێ ، چونکە کێ بێ بتوانێ ئەوە دابین بکا کە بۆچوونەکەی دوکتۆر

ـچوونێکی تەواوو ڕاستبووەو ، ئەو بڕیارە دیکتاتۆری‌یانەی داویە بۆ
ـوودی دۆزینەوەی تێکستی ڕاستەقینەی نالی بووە ، بەتایبەتی کە لەوانەشە
ـوکتۆر دەسخەتی کۆنی فارسی ئامێزی بە خەتی شکستە نووسراوەی بـە
ـشی بۆ نەخوێنرێتەوەو ، لەوانەیە هەر بۆیەش زیاتر ــ وەك خۆی ئەڵێ ــ
ـتی بە نوسخە چاپەکەی عەلی موقبیل بەستبێ ٠

مادەم دوکتۆر نەهاتووە زانسـتی پێویست لەبارەی نوسـخەکانی
ـەردەستیەوە بخاتە بەردەستی خوێندەواران ، ئیتر ئەبێ ئێمە چی لەوە حاڵی
ـین کە دێ هەندێ شـیعری لەوەوپێش بڵاونەکراوەی نالی ئـەداتە پاڵ
ـدەسنووسێك کە ئەڵێ لە ئەڵمانیایەو ئەزانێ دەستی ڕەخنەگری کوردستانی
ـێ ناگاو تەنانەت نەهـاتووە زەنکۆگرافی وێنـەی لاپەڕەیەکیشی لێ بڵاو
ـکاتەوە ! من بەش‌بەحاڵی خۆم دڵنیام لەوە کە دوکتۆر ئەمەی بۆ پاساودانی
ـەرگرتنی ئەو چەند پارچە شیعرەی نالی وتووە کە بـەر لـە ئێمە کەسی‌تر
بڵاوی نەکردوونەتەوەو دوکتۆر خستوونیەتە نـاو چـاپەکەی خۆیـەوەو
نەشی‌وتووە لەکوێی هێناون [ پاشان دێمەوە سەر ئەم باسە ] ٠ یاخود ئەبێ
چی لەوە تێ‌بگەین کـە دێ ( کۆمەڵە دەفتەرو بەیازو پـەڕە کاغەزەکۆنی
ئەرشیفی نامەخانەی تایبەتیی خۆیان ) ئەکا بە سەرچاوە ؟ کام بیبلیۆگرافیا بۆ
ئەم ئەرشیفە خراوەتە بەردەستی خوێندەوار تا بگەڕێینەوە سەری ؟ ئەو کە
ئەڵێ « نامەخانەی تایبەتیی خۆمان » ، لـە یەکێ وایە باسـی کتێبخانەی
بنەماڵەی حەیدەری‌یەکان یا مەردۆخی‌یەکان یا جەلی‌یەکان یـا کتێبخانەی
شێخ موحەممەدی خاڵ یا مزگەوتی گەورەی سلێمانی یا خانەقای بیـارە
ئەکا ٠٠ ئاخر ئەو « کۆمەڵە دەفتەرو بەیازو پەڕە کاغەزە کۆن »انـە هیی
کێن‌و کێ نووسیونیەتەوەو ، ئەمە لەگەڵ ( لێکۆڵینەوەی زانستی )دا چەندی
بە چەندە ؟



له هه‌موو سه‌یرتر ئـه‌وه‌یه دوکتۆر په‌راوێزێکی له‌سه‌ر ئه‌م باسـه نووسیوه تیا ئه‌ڵێ « ئه‌مه به‌شێك بوو له‌و سه‌رچاوانه‌ی کـه که‌ڵکیان لێ وه‌رگیراوه به‌وه‌ی شتی تازه‌یان تێدا بووه ، یا هـه‌ڵه‌ی سه‌رچاوه‌ی‌تریان ڕاست‌کردووه‌ته‌وه • له‌ڕاستیدا زیاتر له بیست نوسخه دیوانی ده‌ست‌نووسی نالی به‌کارهێنراوه بۆ ئاماده‌کردنی ئه‌م چاپه » •

سه‌رچاوه‌کانی دوکتۆر که ناوی‌هێنان ۱۸ بوون • له‌م ۱۸یه ٤یان چاپ‌و ٦یان ده‌سنووسی دیوانی نالی‌و ۷یـان کۆمه‌ڵه ده‌سنووس‌و بـه‌یازو په‌ڕه کۆن‌و تاقه یه‌کێکیشیان بیستن بوو له ده‌می ئه‌م‌و ئـه‌و که دوکتۆر باوه‌ڕی پێ کردوون •• باشه ئه‌گه‌ر وایه که دوکتۆر ئه‌ڵێ ، ئه‌ی بۆ ، با به تاقـه دێڕێکیش بێ باسێکی ئه‌و لای که‌می ١٤ نوسخه دیوانه‌که‌ی‌تره‌ی نه‌کردووه که لای بوون ؟ ئه‌و ته‌نها ناوی ٦ ده‌سنووسی دیوانی نـالیی هێنا ، که‌چی ئه‌ڵێ ته‌ماشای پتر له بیست نوسخه دیوانی ده‌ستنووسی کردووه • ئه‌گه‌ر ڕاسته وایه ، ئه‌ی بۆچی وێنه‌ی لاپه‌ڕه‌یه‌کی ئه‌وانیشی نه‌گرتووه ، که‌چی وێنه‌ی لاپه‌ڕه‌یه‌کی نوسخه‌یه‌کی خه‌تی مامۆستا عه‌لی باپیر ئاغای گرتووه [ هه‌رچه‌ند نه‌شی‌وتووه خه‌تی ئه‌وه ، به‌ڵام ئێمه خه‌ته‌که‌ی ئه‌ناسـینه‌وه ] له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا که مامۆستا عه‌لی باپیر ئاغا به کۆن دانانرێ•• به‌ڵکو وێنه‌ی لاپه‌ڕه‌یه‌کی نوسخه‌یه‌کی ئه‌وه‌نده تازه‌شی گرتووه نیشانه‌ی (۷)ی له‌سه‌ر تیپی (ل) تیا دانراوه ، که ئه‌وه وائه‌گه‌یه‌نێ ته‌نانه‌ت له نوسخه‌که‌ی مامۆستا عه‌لی باپیر ئاغایش تازه‌تره • نا ، به‌ڵکو وێنه‌ی لاپه‌ڕه‌ی گۆڤاری ( ڕۆژی کورد ) و ( ئه‌نجومه‌نی ئه‌دیبان )یشی گرتووه که که‌س گومان له بوونیان ناکا •• ئه‌گه‌ر دوکتۆر به‌ڕاستیه‌تی ئه‌و هه‌موو نوسخه‌یه‌ی لابووه ، بۆچی وه‌ك باسی نه‌کردوون ، هیچ نه‌بێ نه‌شهاتووه وێنه‌ی لاپه‌ڕه‌یه‌کیان بگرێ ؟ دیاره ئه‌م دیوانه ده‌سنووسانه غه‌یری ورده ده‌سنووس‌و بـه‌یازو ده‌فته‌رو په‌ڕه قاقه‌زه کۆنه‌کانن •• بشێ ئه‌م ١٤ نوسخه‌یه تێکڕا له کۆمه‌ڵه ده‌فته‌رو

.ەیزو پەڕە کاغەزەکانی ئەملاو ئەولاو ئەرشیفی تایبەتیی خۆیان بیٚبایەختر
بوون ، یا بشێ چەند وشەیەکیان تیا نەبووبێ نوسخەیەکیتریان پێ ڕاست
کرێتەوە ؟ یا تیایاندا بووە بەلاّم ئەو نەیخوێندوونەتەوە ، یا هەر لەڕاستیدا
ەبوونو نین ، وەك هەموو نیشانەیەك وائەگەیەنێ •



هەروەها لەمباسەدا دوکتۆر نووسیویە ئەڵێ : « لەپاش لێکۆلینەوە
ە هەموو ئەم سەرچاوانە ، بەتایبەتی دیوانە دەســنووسو چاپکراوەکان ،
ز ستییەکمان بۆ دەرکەوت ئەویــش ئەوەبوو کە لــە ڕووی زانستییەوە
دەبوو چاپی سنەی دیوانی نالی بکرێ بە بنجو بنــاوان بۆ ساغکردنەوەی
شیعرەکان، بۆیە هەر پارچە شیعرێك لەسەر کاغەزێکی تایبەتی نووسرایەوە،
ئنجا بەرامبەرو بەراورد کرا لەگەڵ هەموو چــاپو دەسنووســەکانیتر •
ەمەدا هەڵەی چاپیو هەڵەی لەبەر نووسینەوەو ڕوونووسکردنو دەسکاری
کردنی شیعرەکان ئاشکرا بوون • لەئەنجامدا ئەو تێکستەمان هەڵبژارد کە
نە گیانی نالیو ئوسلووبی نالیو دنیای نالییەوە نزیکە •• » •

ئەگەر ئەم قسانەی دوکتۆر وەك خۆیان وەربگرین ، ئەبێ وابگەیەنن
دوکتۆر زۆر چاك چووبێتە ناو جیهانی ناوخۆی نالییەوەو لــە ئوسلووبی
نالی زۆر شارەزا بووبێو بــەو پێیە تێکستی هەڵبژاردەی خــۆی دیاری
کردبێ • بۆ بەلگە هێنانەوە کە ئەمە وانییەو دوکتۆر ، بەداخەوە ، خەلکی
ئەو « جیهانە » نییە ، من هەر ئەوەندە ئەلێم ئەگەر وابوایە دوکتۆر پارچە
شیعرێکیپێنج بەیتیو بەیتێکی نالیی کە هەردوو هەر تورکین ، بەلاّم وەزنو
قافیەو بابەتیان بەتەواوی لە یەك جیایە ، لێ نەئەبوو بە یەك پارچە شیعرو بە
جیاوازیی وەزنو قافیەو بابەتیانی ئەزانیو ئەشــیزانی هیی نالینو تووڕی
نەئەدانە لاوە •• یاخود وشەیەکی وەك (شیرین قەلەم)و (تەسبیحی مورغان)و

(تەسبیح)و ( دیدەباز )و ( سەرســەری‌باز )ی ــ بۆنموونە ــ بەڕاســت مەعنا لێ‌ئەدایەوە [٢٢] .

ئەمە سەرەڕای ئەوە کە ئەو ڕێبازەی دوکتۆر گرتوویەتیە بەر لەگەڵ پێویستی‌یەکانی لێکۆڵینەوەدا یەك‌ناکەوێ کە بەگوێرەی ئەو پێویستی‌یانە ئەبێ لێکۆڵەرەوە هەموو نوسخە دەسنووس‌و چاپەکانی بابەتەکە کۆبکاتەوە کە ئەیەوێ لێی بکۆڵێتەوەو ، بۆ ئەم مەبەستە سەر بە هەر کونێکا بکا کە لەوانەبێ شتێکی لێوە دەسگیر بێ‌و ، چیی دەسکەوتبوو هەر لە سەرەتاوە مەعلووماتی تەواویان لە هەموو ڕوویەکەوە لەبارەوە بدا بەدەستەوە وەك لە کتێبەکانی باســی چۆنیەتیی لێکۆڵینەوەدا ڕوون‌کراوەتەوەو ، بەپێی ئــەو پێڕەوانەی بۆ ئەم مەبەستە دانراون نوسخەی لە هەموان ڕاستتریان بکا بە بناغەو ئەنجا هەرچی جیاوازی‌یەك لە نوسخەکانی‌تردا هەبوو هەموویان لە شوێنی خۆیاندا لە پەراوێزدا بنووسێ‌و، لەکاتی بوونی هەر جیاوازی‌یەکیشدا بە وردی ڕوونی بکاتەوە بۆچی ئەوەیانی لا ڕاستترە .. دیارە ئەمەش ئەبێ لەپاش خوێندنەوەی هەموو تێکستەکان بێ ئەوەندە کە لێکۆڵەرەوە پەردەێ لە ڕووی جیهانی ناوەوەی شێوەی نووسینی ڕوونووس‌کەرەکان لە ڕوودا هەڵگیرێ .. هەروەها لەگەڵ شارەزایی‌یەکی تەواویشدا لــەو بابەتانەی لەوانەیە لەم تێکستەدا پێویست بن ، کە بەش‌بەحاڵی دیوانی نالی شێوەی شیعری غەزەل‌و ، تەعریفی کلاسیکی فارســی‌و ، ئاگاداری لــە بەلاغەو ڕەوانبێژیی عەرەبی‌و، ئەفسانەی کۆنی ڕۆژهەڵات‌و ، چەردەیەك لە کولتووری ئیسلام‌و ، ڕەمزو ئیشارەتەکانی ئەدەبی ڕۆژهەڵات‌و ، بەر لە هەرچی تواناي خوێندنەوەی شێوە نووسینی کۆنی کوردی‌یە کە لەسەر بناغەی نووسینی عەرەبی‌و فارسی دانراوە ..

---

(٢٢) ئەمانەم هەر بۆ نموونە هێناوە . پاشان چاو پیاگێڕانێکی تۆزێ باشمان بە بابەتی فەرهەنگەکەشدا ئەبێ .

جا ئەم مەرجانە چەند لـە کارەکەی دوکتۆردا هاتوونەتەدی ، ئەوە ئەگەر ئەم سەرەتایەدا ڕوون‌نەبوویێتەوە ، بـا بمێنێ بۆ بەشـی دووهەم‌و سێهەمی ڕەخنەکەمان کە لەبارەی چۆنیەتیی نووسینەوەی پارچە شیعرەکان‌و لەبارەی فەرهەنگی دیوانەکەوە پاش ئەم بەشی یەکەمە ئەیانووسین •



دوکتۆر مارف لە بابەتی « ئەو شیعرانەی هیی نالی نین »دا نۆ پارچە شیعری دەس‌نیشان کردووە کە بە بۆچوونی ئەو هیی نـالی نـین • پێنج پارچە لەم نـۆ پارچەیە لـە چاپی سـنەو هەولێری دیوانی نـالی‌دا بڵاو کراونەتەوە • چواریشیان هەر لە چاپەکانی هەولێردا بڵاوکراونەتەوە •

پێنج پارچەکە ئەمانەن :

(١) ڕوخم ڕەنگینی ڕەنگی ڕوومەتی ڕەنگینتە ، بازا
(٢) عەزیزم ، ڕۆحی شیرینم ، دو چاوم
(٣) ماچی دەمەکەی دامێ کە دامێ سەرو ماڵم
(٤) هێندە بێزاری کە زانیومە بە زاری نایەوە
(٥) با ڕەفیقانم بکەن شیوەن کە وەقتی زاری‌یە

چوار پارچەکەش ئەمانەن :

(١) سەیلی ( د : سەیری ) هیجرت بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامەدەر
(٢) شەوی یەلدایە یا دەیجوورە ئیمشەو
(٣) ئەمڕۆ عاشوورایە دونیا بۆیە تارو پڕ تەمە
(٤) دەروێش نی‌یەم کەوتوومە ئێل بە حەی حەی

پێنج پارچەکە هیچ‌کامیان لە هیچ‌کام لە دەسنووسەکانی بەردەستی ئێمەشدا نەبوون ، بەڵام ئێمە لە نالی‌یەکەی خۆماندا ، چوارەمیان نەبێ ، هەموویـانمان بڵاوکردووەتەوەو سـەرنجی خۆێشـمانمان لەبارەیانـەوە

پیشانداوه • تێکڕا ئێمەش بە دوورمان زانیوە ئەمانە هیی نالی بن و وتوومانە ئەگەر هیی ئەویش بن ، هیی سەرەتای شیعر وتنینی • جا ئەگەر وابێ ، دیارە ئەوە هەر خۆی پاشان پشتگوێی خستوون و هەر بۆیەش نەکەوتوونەتە ناو دەسنووسەکانەوە • بەشبەحالی پارچەی چوارەمیش ڕوونمانکردووەتەوە کە هیی مەلا صالحی حەریقە •

هەرچی چوار پارچەکەشە، ئەوە یەکەمیان لە دەسنووسەکانی بەردەستی ئێمەدا لەوەی ( کاگردەلی )و ( موحەممەد ئەمین زەکی )و ، دووهەمیان لە دەسنووسەکانی (چروستانی)و (چنگنیانی)و (موحەممەد ئەمین زەکی)و (مەلا عەزیزی ڕێشاوی)و (مەلا ئەحمەد)و نوسخەی یەکەمی کتێبخانەی (شێخ موحەممەدی خاڵ)دا هەبوون ، بۆیە نەمانتوانی ، دوکتۆر ئاسایی ، ئەم هەموو نوسخانە کە تێکڕا نوسخەی جێگای باوەڕو متمانەن ، بەدرۆ بخەینەوە • ئەو دوو پارچەکەیتر ئێمەش بڵاومان نەکردوونەتەوە •

من لاموایە ئەبوو ئێمەش ئەو دوو پارچەکەشمان بڵاو بکردایەتەوەو ، دوکتۆریش هەموویان بڵاو بکاتەوەو پەراوێزێکیان لەسەر بنووسێ ، باری سەرنجی خۆیی وەك ڕەخنەگرێکی کارامەو لێهاتوو تیا ڕوون بکاتەوە • ئەگەر وایبکردایە دیارە لەلایەکەوە هیچی لەسەر نالی نەئەکرد بە ماڵو ، لەلایەکیتریشەوە ڕێگای لەوەش ئەبڕی سبەینێ کەسێ بلێ ئەو بۆچی بیرو ڕای خۆی لە هەموشتێکدا بە زۆرەملێ ئەکا بە سەرپشك • ڕاستەکەی ئەگەر کەسێك بەڵگەی زانستییانەی بەدەستەوە بێ و متمانەی بە بیرو ڕای خۆی هەبێ لەوە ناترسێ بیخاتە ڕوو ، بۆیە ئەبوو دوکتۆریش تێکستی شیعرەکانو ڕای تایبەتیی خۆی پێکەوە بڵاوبکاتەوەو ڕێی ڕاستیش هەر ئەمەیە •



دوکتۆر لە دوادێڕەکانی ئەم باسەیدا ئەشلێ « لە دەسنووسەکاندا

شیعری‌وامان بەرچاو نەکەوت کە گومان لە نالی‌یەتی‌یان بکرێ تەنیا دوو سێ پارچە غەزەل نەبێ •• بەلاّم لە بەیازو دەفتەری شیعرەکاندا هەندێ شیعری‌وا بە ناوی نالی‌یەوە تۆمار کراون نابێ هیی ئەو بن » •

من نالێم ئەبێ ئەم بۆچوونەی دوکتۆر بە ناچاری هەلە بێ • لەوانەیە ڕاست بێ • بەلاّم ئەم ڕازی‌یەتی‌یەی دوکتۆر لە بیرو ڕای خۆی‌و باوەڕ بەوە نەکردنەی کـە لەوانەیە کەسـێکی‌کەش هـەبێ بتوانێ ڕایـەك دەرببڕێ ڕێی‌تێ‌بچێ ڕاست‌و دروست بێ ، لەپای‌چی ؟ دوکتۆر پشت بە کام (وەحیی مونەززەل ) ئەم بڕیاری ( ئەبێ )و ( نابێ )یە ئەداو ئاخۆ ئەلێ چی ئـەگەر خەلکی‌تریش هەروا بە (ئەبێ)و (نابێ)یەك لە ڕووی ئەودا ڕاست ببنەوە ؟ ئاخۆ زانست لە حالی‌وادا چیی دەسگیر ئەبێ‌و ، دوکتۆر چ‌خشتێکی نوێ بەم جۆرە هەلوێستە دوور لـە گیانی زانست‌پەروەری‌یەی ئەخاتە سـەر دیواری کەلەپووری زانستی مرۆڤایەتی ؟ خۆزگە وەلاّمێکی ( زانستی‌یانە)م لەم‌بارەوە لە دوکتۆر خۆی ئەبیست !••



دوکتۆر بابەتێکیشی بەم ناوو نیشانە نووسیوە « شـیعرێکی تورکی بەناوی نالی‌یەوە تۆمارکراوە » • لەم بابەتەیدا ئەلێ « ••• ئەوەی گرنگ بێ لە کۆمەلە دەسنووسێك‌و بـەیازو دەفتەری شیعردا پارچە شـیعرێکی شەش‌دێڕی بە ناوی نالی‌یەوە نووسراوە ، لەلای خوارەوە بۆ یەکەمین جار بلاّوی ئەکەینەوە :

تیر ناز نگهك هر دلی گچسە یری وار
عاشقك پاینە زلفك گبی یوز بیك سری وار
اول مـە زهرە جبین در بناگوشنە چوق
نامور سبعە سیارە گبی مشتری وار
بزم می در ندما جمع قدح گردە شده
سوفی کمین ورد دعای سحر ایلە یری وار

عكس زلفك قدح دیدهء گریا نمده
نشای سنبل تر شیوهء نیلوفری وار
ناودان قلم « نالی » فصاحتده همان
نشای آب بقا زمزمهء کوثری وار
نفس ساعت گبی ایشلرسه‌گر یادایله طاعتدر
بر آنك قورمه‌سه پیر یولنه احیای ساعتدر

« بەڕاستی جێی شانازی‌و گوشادی دەبوو کە ئەم غەزەلە تورکی‌یەش جێگەی خــۆی لــە دیوانی نالی‌دا بکردایــەوە ، وەکوو غەزەلە تاقانــە فارسی‌یەکەی کە لەم دیوانەدا بەرچاوی خوێندەوار دەکەوێ . ئــەوەی ئاشکرایە ئەوەندەی شیعرە فارسی‌یەکە بە دەم هاوار دەکاو دەڵێ : من نالیم! ئەوەندە شیعرە تورکی‌یەکە دەڵێ : من نالی نیم !

« من باوەڕم بەهێزە کە ئەم شیعرە تورکی‌یە لەڕووی داڕشتنەوە لــە جیهانی خەیاڵی نالی‌یەوە دوورە ، ئــەگەرچی لە مەعنادا ئەوەی دروســتی کردووە شارەزای نالی بووە . من لەسەر ئەو باوەڕەم کە یەکێکی شارەزای نالی ئەم شیعرەی داناوە بۆئەوەی نەڵێن نالی شیعری تورکیی نەبووە ، بۆیە جارێ [ بۆ « جارێ » ؟ بشێ دوکتۆر دوودڵ بێ لەو کارەی کردوویە ؟ — م ] ئەم غەزەلەمان لەم دیوانە دوورخستەوە » ...

یەکێ کە ئەم دێڕانە ئەخوێنێتەوە ، ئەگەر سوور دڵنیایش بێ لەوە کە دوکتۆر فڕی بەســەر تێگەیشتنی جیهانی خــەیاڵی نالی‌یەوە نی‌یە ، بیرێك ئەکاتەوەو لە دڵی خۆیدا ئەڵێ لەوانەیە من بەهەڵەدا چووبم‌و دوکتۆر بەڕاستی شارەزاو فەرمانڕەوای ئەم جیهانە بێ .. دوکتۆر ئەوەندە بەمتمانەوە بــە خۆی قسە ئەکا ، ئەبێ بنیادەم زۆر چاو سوور بێ بتوانێ گومان لە ڕاستیی قسەکانی بکا .. بەڵام تۆزێ بیرکردنەوەو وردبوونەوە بەسە بۆئەوە بنیادەم تێبگا تیری بیری دوکتۆر تا چ ڕادەیەك نیشانەی ڕاســتیی پێکاوە . من ناڵێم ئەبوو دوکتۆر هــەر بە بەیتی دووەمی پارچــە پێنج بەیتی‌یەکەدا

بیناسی‌بایەتەوە کە هیی نالی‌یە چونکە ئەوە پلەیەکی باشی چەشی ئەدەبیی ئەوێ کە لەوانەیە لای هەمووکەس دەسگیر نەبێ ، بەلام ئەوێ کە پارچە شیعرێکی پێنج بەیتی‌و تاقە بەیتێکی جیای لێ ببێ بە یەك غەزەل‌و بە تەقەی تفەنگیش بەلای ئەوەدا نەچێ کە ئەم پارچە پێنج بەیتی‌یەو ئەو تاقە بەیتە هەم وەزن‌و هەم قافیەو هەم بابەتیشیان جیایە لە یەك ، ئەبوو مافی ئەوەی نەدایە بە خۆی وا بە دلنیایی‌یەوە چێو لە تاریکیدا بهاوێژێ .. دوا وشەی هەر کام لە بەیتەکانی پارچەکە وشەی (وار)ە کە (ری)یەکی (بە «ر»ی سووکی) لەپێشەوەیە ، کەچی دوا وشەی تاکە بەیتەکە (در)ە . پێنج بەیتەکە لە بەحری ( ڕەمەل )ە کە ئەکاتە ( فعلاتن ، فعلاتن ، فعلاتن ، فعلات ) . کەچی بەیتە تاقانەکە لە بەحری ( هەزەج )ە کە ئەکاتە ( مفاعیلن ، مفاعیلن ، مفاعیلن ، مفاعیلن ) . بابەتی پارچە پێنج بەیتی‌یەکە غەزەلە ، کەچی بابەتی تاقە بەیتەکە تەصەووفە..ئەمە جگە لەو هەموو هەلەیە لە نووسینەوەی تێکستی پارچە پێنج بەیتی‌یەکەو تاقە بەیتەکەشدا کە نیشانەی ئەوەن دوکتۆر وەك لە عەرووضەکەدا کۆلە ، لە زمانیشدا هەر ئەوەندە تورکی ئەزانێ لە بەرابەری تورکی نەزانێکی وەك مندا خۆی پێ هەلکێشێ [٢٣] ..

سەرباری مەینەتیش ئەوەیە دوکتۆر لە پەراوێزی ئەم بابەتەدا نووسیویە : « لەپاش لێکۆلینەوەیەکی باش‌و پرسیارکردن لە شارەزایانی ئەدەبی کلاسیکیی فارسی‌و عوسمانی‌و هەموو زمانە تورکی‌یەکان ، گەیشتمە ئەو ڕایەی کە ئەم پارچەیە بەجۆرێك لە موسەممەط (مسمّط) یا مووەششەح ( موشّح ) دابنێم » !

بەرابەر بەمەشی من ئەمەوێ هەر ئەوەندە بلێم مەسەلەکە ئەم هەموو ئەرکەی نەئەویست‌و پێویست بەوە نەبوو دوکتۆر بکەوێتە گەڕان بەدوای

---

(٢٣) بۆ دەرخستنی هەلە زۆرەکانی دوکتۆر لە نووسینەوەی ئەم « پارچە شیعر »ەدا بڕوانەرە : مەلا عبدالکریمی مدرس‌و فاتح عبدالکریم ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢١٧ ــ ٢١٩ .

شـارەزایانی ئەدەبی کلاسیـکی فارسـیو عوسـمانیو هەموو زمـانە تورکی‌یەکاندا[٢٤] . هەر لەوپەڕی تورکستانی چینەوە تا لە تەنگەی بوسفۆڕ ئەپەڕێتەوە .. کەچی ئەنجامی ئەم هەموو لێکۆڵینەوەو پرس‌کردنەش ئەوەبێ ئەم زانا بەڕێزانە بیخەنە هەڵەوەو سەری لێ بشێوێنن ... سەرەڕای ئەوە کە زانا نابێ لەم شوێنە بەرچاوی‌یانەدا بە ( یا )و .. ( یا ) حوکم‌بدا ، شـەش بەیتەکە وەك وتمان دوو پارچەیە ، پارچەیەکی پێنج بەیتیو فەردێکی بەتەنها کە لە هەموو ڕوویەکەوە جیان لە یەك .. موسەممەط و مووەششەحیش هیچ لەئارادا نین . لای زانایانی زانستی عەرووض موسەممەط ئەوەیە شـاعیر چوار یا پێنج یا شەش تا دە نیوە شیعر واتە دوو بەیت تا پێنج بەیت لە یەك وەزنو لەسەر یەك قافیە بڵێو پاشان نیوە شیعرێکی‌تر لەسەر هەمان وەزن ، بەڵام لەسەر قافیەیەکی‌تر بڵێ ، کە دیارە لێرەدا وا نەکراوە ، چونکە بەڵێ ڕاستە لێرەدا پێنج بەیت لەسەر یەك وەزنو قافیە وتراوە ، بەڵام ئەگەر بەیتە جیاکەشیان پێوە هەڵواسین ، بەیتێکی تەواو پەیدا ئەبێ لە وەزنو قافیەیەکی جیا نەك نیو بەیت کە هـەر قافیەکەی جیابێ . ئەمە سـەرەڕای جیاوازیی بابەتیشیان . مووەششەحیش ئەوەیە شاعیر لە سەرەتای هەر نیوە بەیت یـا هەر بەیتێکدا وشەیەك دانێ ، لە تیپی یەکەمی ئەو وشانە ناوی کەسێك یـا شتێك پەیدا ببێ . دیارە ئەمەش لێرەدا نی‌یە ..

کەواتە صەد بریا دوکتۆر ئەم تەواضوعەشی پیشان‌نەدایەو ئەم پرسەی بەم هەموو زانایە نەکردایەو ، ئەو هەڵە زەقو ئاشکرایە نەدرایەتە پاڵ کەس لەمانەو هەر بۆ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی بمایەتەوە .

من وای بۆ ئەچم دوکتۆر کە بیری کردووەتەوە زوربەی خوێندەوارانی کورد تـورکی نـازانو عیلمی عەرووضیشیـان نەخوێنـدووەو بـاسی

---

(٢٤) لای زانایانی زمان شتێك نی‌یە پێی‌بڵێن ( زمانە تورکی‌یەکان ). ( زمانـە توورانی‌یەکان ) هەیە کە ( زمانی تورکی )یش یەکێکیانە ..

( موسەممەط )و ( مووەششەح )یان نەبیستووە ، لەوەوە هەلی بــە تالآن زانیوە تا ئەم بێئاگایی‌یەی خۆیان بەسەردا داسەپێنێو ، ئــەو «ڕا»یەی پێی گەیشتووە بەسەریانەوە بیکا بە ماڵ،وەك زۆر جاری‌تریش وای‌کردووە٠٠ بەڵام کورد واتەنی گۆزە هەمووجــارێ بە ساغی ناگەڕێتــەوە لــە کانی‌و ، دوکتۆریش ئاخری کەسێکی هەر لێ ڕائەپەڕێ بڵێ مــالی قەلب ســەر بە خاوەنیەتی‌و شتە ناڕاستەکانی بداتەوە بە ڕوویدا ٠



دوکتۆر لە بابەتی « بەرنامە بۆ تێگەیشتنی نالی »یشدا ئەڵێ : « بۆ کردنەوەی دەرگای ئەو جیهانە نهێنی‌یەی کە نالیی پێ دەڵێن ، پێویست بە بەرنامەیەکی ڕێك‌وپێك هەیــە ٠ هەرچەندە ئێمە لــە دەمێکەوە خەریکی هێنانەدیی ئەم بەرنامەیەین ٠ بەڵام ئەمە ڕێگە لە کەس ناگرێ کە خەریکی نالی بن ، چونکە جیهانی نالی ئەوەندە فراوانە ، ئەوەندە تەنگو چەلەمەی تێدایە هەوڵو کۆششو شەونخوونیی زۆری دەوێ » ٠

« بەلای ئێمەوە تێگەیشتن لە شیعری نالی‌و خۆشەویست‌کردنی لەلای نەوەی خوێندەواری تازە پێگەیشتووی نەتەوەی کورد بە ساغ‌کردنەوەی بەرهەمی شیعریەتی ، ئەمەش بە سێ قۆناغ دێتەدی٠ ئەم قۆناغانە هەریەکەیان پێوەندیی بە ئەوی‌ترەوە هەیە ، هەموویان بەتێکڕایی وێنــەی ڕاستەقینەی نالی دەدەن بەدەستەوە :

« ١ــ بڵاوکردنەوەی دیوانی نالی بە بێ‌هەلەو ساغ‌کردنەوەی هەموو تەنگ‌و چەلەمەیەکی کە لە دەسنووس‌و دیوانە چاپکراوەکاندا هەیە ( ئێمــە هەولمان داوە لەم چاپەدا ئەم مەبەستە بهێنینەدی ) ٠

« ٢ــ فەرهەنگی نالی ٠ ( لەم چاپەدا ئەمەش بەرچاو دەکەوێ ) ٠

« ٣ــ لێکۆلینەوە لە ژیانو بەرهەمی نالی ( ئەم کارە بەدەستەوەیە )٠

« هێنانەدیی ئەم بەرنامەیە نالی دەخاتە جێی ڕاستەقینەی خۆی لە ئەدەبی کوردیدا ، هەروەها لە دڵی خوێندەواراندا جێی خۆی دەگرێ •

« ئێمە کە گلەیی لە خوێندەوارانی نەوەی تازە دەکەین لەبابەت ئەوەوە کە نالیو شاعیرانی کلاسیکیتر ناچنە ناو دڵیانەوە نابێ تەنیا بیر لەوە بکەینەوە کە ئەمانە هوشیارانەو لەڕووی تێگەیشتنەوە ئەدەبی نالی بە ئەدەبێکی بێبایەخو بەسەرچوو دادەنێن • ڕاستە لەوانەیە هەندێ کەسیوا هەبێ ، بەڵام ئەمە تەنیا ئەدگاری کۆمەڵی کوردەواری نییە ، بەڵکو شەپۆلێکی بەرەڵڵاییە لە هەندەرانەوە ڕووی لە ئێمە کردووە » •

ئەوەی لەمبابەتەوە پێویستە بووترێ ئەوەتە کەوا کۆمەڵە هۆیەك خڕبوونەتەوە ڕێگایان لەوە گرتووە کە تێکڕای شیعری کلاسێك بە بێهەڵە بکەوێتە بەردەستی خوێندەواری وەچەی ئەمڕۆمان • ئەمەش لەگەڵ هەندێ هۆیتردا بوون بە مایەی ئەوە کە تێینەگەنو چەشینەکەن • هۆیەکانی ئەوە کە ئەم شیعرانە بێهەڵە نەکەوتوونەتە دەستی خوێندەوار ، ئەوەن کە بەر لە هەرچی تێکڕا شیعر لە کۆمەڵگای ڕۆشنبیری جارانی کورددا کە کۆمەڵگای مەلاو فەقیی حوجرەو مزگەوت بوو ، پلەیەکی خوارتری لە زانستەکانی مەلایەتی بووە • لەبەرئەوە زیاتر کۆلکە مەلاو کۆلکە فەقێ خۆیان بە نووسینەوەو خوێندنەوەیەوە خەریك کردووە • لەبەرئەوەش کە ئەو شیعرانە گەلێ بابەتو زاراوەی خوێندەوارانەی بەرزیان تیا بووە کۆلکە مەلاو کۆلکە فەقێ تێیان نەگەیشتوونو، لەبەرئەوەش کە نووسینی جارانی کوردی بە ڕێنووسی فارسی بووەو ئەو ڕێنووسەش بە فریای پێویستییەکانی زمانی کوردیدا ناگا ، هەڵەیەکی زۆر کەوتووەتە نووسینەوەی شیعرەکانەوە[٢٥]

(٢٥) لەگەڵ هەموو ئەوەشدا نالی لە هەموو شاعیرانی دیالێکتی کرمانجیی خواروو بەختەوەرتر بووە . دیوانیکەس لەم شاعیرانە ئەوەندە زۆر نەنووسراوەتەوەو مەلای قابیلو پایەبڵند بە شیعری هیچ شاعیرێکی ئەم

هەرچەندیش زەمانە بەرەو پێشتر هاتووە ، قوڕەکە خەستتر بووەتەوە ، چونکە وەچەی یەکەمی خوێندەوارانی قوتابخانەکانی میری دڵیان پڕکراوە لە دژایەتی لەگەڵ خوێندنی کۆنو تێکڕای کولتووری کۆنو مەلاو فەقێیان وەك نیشانەی ڕابوردوویەکی ڕزیو خراوەتە بەرچاو • ئەمە خۆی (ردالفعل)ێکی منالآنەی وەچەی خوێن گەرمی نوێ بووە بەرابەر بە پاشکەوتوویی کۆمەڵەی کوردەواری، ئەتوانین وای ناو بنێین پەڕگرییەکی چەپڕەوی کولتووری ( تطرف یساری ثقافي ) بووە • لەولاشەوە مەلاو فەقێیش بە سەرنجێکی کۆنەپەرستانەو شێت گیرانە تەماشای خوێندنی نوێو خوێندەواری نوێیان کردووەو بە جۆرە کوفرو ئیلحادو فەرمەسۆنییەکیان داناوە • ئەم دوو هەڵوێستە بوون بە هۆی ئەوە کە لێكدابڕانێکی تەواو لەنێوان خوێندەواریی کۆنو نوێدا پەیدا بێ ، داهاتنی وردە وردەی ڕێنووسی نوێی کوردی و پشت گوێ خستنی ڕێنووسی کۆنو تێکڕای کولتووری کۆنیش لە قوتابخانە دەوڵەتییەکاندا، ئەم لێكبڕانەی قووڵتر کردووەتەوە • تا لەم سالآنەی دواییدا هەندێ خوێندەواریوا پەیدا بوون ، لە ڕێگای گیانی نەتەوەپەرستیو پێویستیی بووژاندنەوەی کەلەپووری نەتەوەییو گەشەپێدانی شانو شکۆی میللییەوە سەودای لێکۆڵینەوەو بلاوکردنەوەی ئەدەبی کۆنی کوردیان کەوتە کەللە ، تەماشای ئەوەش کە گەلانی زیندووی جیهان لەم مەیدانەدا چی ئەکەن ، زیاتر پالی پێوە نان بۆ گرتنەبەری ئەم ڕێگایە ، بەلآم کارەکەیان وا بەدەستەوە نەهات کە پێویست بوو• ئەبوو هەر وایش بێ چونکە مەرجەکانی ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە گەورەیەیان تیا نەهاتبوەدی •• ئەگینا کەسانێ کە شارەزای کولتووری ئیسلامو ئەدەبی کلاسیکی ڕۆژهەلاتو عەرووضو

---

دبالێکتەوە ئەوەندەی شیعری نالی خەریك نەبوونو خۆیان ماندوو نەکردووە .

ڕەوانبێژیی عەرەبیو شێوەی نووسینی فارسی نەبن ، دیواتێکی کۆنیوایان چۆن بۆ ڕاست ئەکرێتەوە بـە خەتێکی نـاخۆشی کۆلـکە فەقێیـەك نووسرابێتـەوەو شیعرەکانی پڕ بـن لە بـابەتو زاراوەیوا لـە هیچ قوتابخانەیەکی دەوڵەتیدا نەیانخوێندبێ !؟. بێمەیلیی تـوێژێکی فراوانی خوێندەواری ئـەمڕۆی کورد بەرابەر بە ئەدەبی کۆن ، لـەم ڕێگایەوەیەو پێوەندی بە شەپۆلێکی بەرەڵڵاییەوە نییە لە هەندەرانەوە ڕووی کردبێتە ئێمەو ئەمە لێکدانەوەیەکی زۆر ڕووکەشو سەرپێیییە ، ئەگینا بۆچی لـە ئینگلتەرەدا هەڵوێستێـــکیوا بەرابەر بە کەســانی وەك شەکسپیرو ، لـە فەرانسەدا بەرابەر بە کەسانی وەك ڕۆسۆو لامارتینو لە ڕووسیادا بەرابەر بە پوشکینو لێرمەنتۆف نییە ؟. کێ ڕاست ئەکا با بێ بەڕاستی ، نەك هەر بە قسە، شیعری کەسانی وەك نالی شیبکاتەوەو بیخاتە بەردەستی خوێندەواری ئەمڕۆی کورد ، جا بزانێ چۆن بە دەســتو دەم بۆیی ئەقۆزنەوەو بە دڵ ئەیخوێننەوەو وەك خۆشترین ئاوازو بەستە لەبەریئەکەن ؟ ئەگینا کەسێك نەزانێ لە ئـاییندا هەیە کەوا پەلەوەر ( سبحـان الله ) ئەکەنو ، ئەوەندە شارەزای زمان نەبێ بزانێ ( تەسبیح ) بەمەعنا ( تەزبیخ ) نییە ، وەك چۆن بە مەعنای ئەوکەسەش نییە کە بڵێ ( سبحان الله ) ، و ( مورغ )یش نـە ( هێلکە )یەو نە تەنها ( مریشك )ە بەڵکو تێکڕای پەلەوەرە ، دیارە ناتوانێ ( تەسبیحی مورغان ) کە لە شیعرێکی نالیدا هەیە بەڕاستی مەعنا لێبداتەوەو ئەنووسێ « تەسبیحی [واتە : تەزبیحی] لە هێلکەی مریشك دروستکراو» و « کینایەتە بۆ تەسبیحی دەنك درشت » ، هەرچەند تەزبیحیوایش هەرگیز لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نەبووبێ ! یا ( شیرین قەلەم )یی گوێرێژەکەی نالی وا مەعنا لێبداتەوە کە واتە : « جوان دەنووسێ » و « خاوەن ئوسلووب »ە « لە نووسیندا »و « بەرهەمی شیعرو نووسینی نایابی هەیە » یا کەســێك فەرقی ( مەصدەر )و ( فیعل )و (صیفە)و (ئیسمی فاعیل)ی عەرەبی نەکا وەك

نه ( تەسبیح )دا کە بە ( موسەببیح )ی مەعنا لێبداتەوە ، یا لە (ئیخلاف)دا
کە بە ( بەڵێنی بە درۆ )ی مەعنا لێبداتەوە . یا (مەوسیم)ی بەمەعنا (وەرز)
بە ( مووسیم ) بنووسێتەوە ، یا بڵێ ( ئیحیاء [نەك ئەحیاء] ) جەمعی (حەیی)ەو
بە (زیندوو)یش‌و بە (زیندووکردنەوە)یشی مەعنا لێبداتەوە ، کەسێکی‌وا ،
دیارە ئەگەر خەریکی دیوانێکی شیعری کلاسیکی کوردی بێ‌و بەم‌جۆرەی
مەعنا لێبداتەوە ، ئەوە ئەبێ تێکستەکەشی بەجۆرێکی‌وا ڕاست‌کردبێتەوە
لەگەڵ ئەم جۆرە لێکدانەوەیەدا بگونجێ‌و ، ئەبێ هەر لێکۆڵینەوەیەکیشی
لەمەوپاش لەسەر بکا ، هەر لەم چەشنە بێ .. لە حاڵی‌وادا خوێندەواری
نوێ هەقیەتی لە شیعری کلاسیك نەگاو نەچێتە دڵیەوەو بە تەقەی تفەنگیش
لێی نزیك نەکەوێتەوەو ، بۆ لێکۆڵەرەوەکەش‌و بۆ خاوەن شیعرەکەش‌و بۆ
تێکڕای ئەدەبی کوردیش هەزاری خێرەو دوو هەزاری بەرەکەت ، دەس بۆ
کاری‌وا نەبرێ‌و وازی لێ بهێنرێ بۆ ئەواتەی بەخۆیاندا ڕائەپەرموون‌و
گوێ بۆ سەعدیی شیرازی شل بکرێ کە ئەڵێ :

**کار هر بز نیست خرمن کوفتن**
**گاو نر میخواهد و مرد کهن (٢٦)**

ئەمە هەموو ، وەك ئەڵێن ، با ( دەرکەنار ) بێ .. بەڵام دوکتۆر بۆچی
بۆی ڕوون‌نەکردووینەتەوە چۆن دیوانی نالی بێ‌هەڵە بڵاو ئەکرێتەوەو ، ئەو
خۆی چۆنی هەوڵداوە ئەم مەبەستە لەم‌چاپەدا بهێنێتەدی ؟ ئەگەر باسی
بکردایە لەوانەبوو کەسێکی‌تر لە لێکۆڵینەوەی دیوانێکی‌تردا کەڵکێکی لێ
وەربگرێ‌و چاوی لێ بکا .. خۆ ناشێ ئەمەیش ( سیڕی میهنە )کەی
وەستاکانی جاران بێ کە لە مناڵەکانی خۆیان بەولاوە بە کەسیان نەئەوت‌و

---

(٢٦) واتە :
**کەی کاری بزنە گێرە کا خەرمان !**
**کەڵەگای نەوێ‌و جووتیاری لێزان ..**

نەیان‌ئەهێشت زانستی پیشەکەیان لەناو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە بۆئەوەی خەڵك هەر ناچاری هاتنەلای ئەوان خۆیان بن ..



هەر لەم‌باسەدا دوکتۆر ڕستەیەکی هەیە تیا ئەڵێ : « ئنجا ئەگەر بێتو وشە قورسەکان‌و تەعبیرە داخراوەکان بەجۆرێك ڕوون بکرێنەوە کە ئاسان بن ، نەك قورستر بکرێن .. تاد » . من بەش‌بەحاڵی خۆم تێ‌ناگەم چۆن ڕوون‌کردنەوە ئەبێ بە هۆی قورســـتر کردنی بابەتە ڕوون‌کراوەکە .. من تائێستا نەم‌بیستووە ڕوون‌کردنەوەیەك هەبێ ببێ بـــە هۆی قورسترکردنی مەعنای بابەتە ڕوون‌کراوەکە . ئـــەگەر وابێ ڕوون‌کردنەوە نابێ . خۆزگە دوکتۆر نموونەیەکی ئەم جۆرە ڕوون‌کردنەوەیەی بۆ بهێنایەتەوە .



دوکتۆر مـــارف لـــە بابەتی « فەرهەنگی دیوانی نـــالی »دا ئەڵێ : «ڕێکخستن‌و دانانی ئەم فەرهەنگە بۆ شاعیرێکی کوردی وەکو نالی یەکەمین هەوڵ‌و تەقەلایە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی‌دا . سوودی فەرهەنگی نالی تەنیا لەوەدا نی‌یە کە تاڕادەیەك مانای شیعری شاعیر ڕوون دەکاتەوە ، بەڵکو دەتوانین ئەم فەرهەنگە بە کلیلی قوفڵی شیعری کلاسیکی کوردی دابنێین لە کوردســـتانی خوارووداکە نالی دامەزرێنەریەتی لـــە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە تا ماوەی نێوان هەردوو جەنگ ، جەنگی جیهانیی یەکەم‌و دووەم ، چونکە ئەو کۆمەڵە وشەو تەعبیرانەی کە نـــالی بەکاری‌هێناون ، زوربەی هـــەرە زۆریان بەردی بناغەو بنچینـــەی زمانی شـــیعری ئەدەبی کوردستانی خواروو بوون ، دیارە هەر شاعیرەو کۆمەڵە وشەو تەعبیرێکی تایبەتیی خۆشی هەیە » .

بەش بەحاڵی ڕستەی یەکەم کە دوکتۆر کارەکەی خۆی بــە یەکەمین هەوڵو تەقەلا دانا لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردیدا ، خۆم بە ناچار ئەزانم ڕاستو ڕەوان بڵێم وا نی یــە ، چونکە ئەم جۆرە مــەعنا لێدانەوەی تاکە وشەکانی دیوانی نالی یە کە دوکتۆر کردوویەتیو ڕەپو ڕاســت ڕێچکەی فەرهەنگ نووسینی عادەتیی تیا گرتووە لەگەڵ کۆمەڵێ هەڵەو ناتەواوییشدا کە پاشان ئەگەڕێینەوە ســەر باس کردنیان ، ئــەوە نی یە کە لــە کۆڕی لێکۆلەرەوانی ئەدەبدا پێی ئەڵێن ( فەرهەنگی فلانە شــاعیر یا ئەدیب ) •• بەڵکو ئەگەر ئەوەش بوایە هەر وا نەئەبوو کە دوکتۆر ئەیڵێ• ئێمە ئەگەر تەنها لێکدانەوەی وشــەمان مەبەست بێ ، بێ گوێ دانە ئــەوە کە شــاعیر چ مەعنایەکی لە وشەکە مەبەست بووە ، ئەوە چ لە داوێنی شیعرەکانەوە لە لاپەڕەکانیانداو چ لە دواییی دیوانەکەوە ، کراوەو هەیەو بەڵکو ئەوەش کە تائێستا کراوە گەلێ لەمەی دوکتۆر پوختترە ، چونکە ئەوەی تیا ڕەچاو کراوە کە شاعیر چ مەعنایەکی وشەکەی مەبەست بووەو لە کاری خەڵکی تردا کەمتر مەعنای نامەبەستی وشە هێنراوەتە ئاراوەو زۆر لەو ناتەواوی یانەشی تیا نی یە کە لە کارەکەی دوکتۆردا هەن • نموونەی ئەوە کە مەعنای وشە لە داوێنی لاپەڕەوە لێک درابێتەوە وەك ( دیوانی مــەولەوی )یەکەی باوکمو ( دیوانی صەیدی )یەکەی موحەممەد ئەمین کاردۆخی • نموونەی ئەوەش کە وشەکان لە دواییی کتێبەوە ڕێکخرابنو مــەعنایان لێ درابێتەوە ، وەك زوربەی کارە ئەدەبی یەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، لە چەشــنی ( تحفەء مظفریە ) بە هەردوو بەرگەکەیەوەو ، ( شیرینو خوسرەو )ی خانای قوبادیو (قەڵای دمدم)و (ئەفسانەی چیای ئاگری)و •• تاد •

لە کۆڕی ئەدەب دۆستانو زانایانی ئەدەبدا کە ئــەڵێن ( فەرهەنگی فلان )و ناوی کەسێ دیاری ئەکەن • مەبەستیان ئەوە نی یە ئەو فلان کەسە لە چ بەرەیەکی ئەدەبی یە تا فەرهەنگی زاراوەکانی ئەو بەرەیە ڕێك بخەن بۆ کارە

ئەدەبی‌یەکەی ئەوکەسەو بە ناوی ئەوەوەی ناو بنێن ، وەك ئەوە کە کابرا لە بەرەی موتەصەوویفە بێ‌و زاراوەی تایبەتیی موتەصـــەوویفەکان بەکاربێنێ وەك (وەجد)و (ڕابیطە)و (وجوود)و (فەنا)و (بەقا)و شـــتی‌وا •• هەروەها تێکڕای قۆناغێکی ئەدەبی‌یش نی‌یە وەك ئەوە کە لـە ئەدەبی کلاســیکی ڕۆژهەلاّتدا کۆمەڵە زاراوەو ئیستیعارەو مەجازو کینایەو تەشبیهێك بووە بە باوو زۆری دووبارە ئەکەنەوە ، تا فەرهەنگێکی تایبەتی بۆ ئــەو زاراوەو وشەکاری‌یانە ڕێك‌بخرێ کە شــاعیرێك لــە دیوانەکەیدا بەکاری‌هێناون‌و فەرهەنگەکە ناوی ئەو شاعیرەی بە هەڵە بخرێتە سەر • بەڵێ ئــەم جۆرە کارانــە پێویستی ژیــانی ئەدەبیی ئەمڕۆمانن‌و کلیلی لێکدانــەوەی گەلێ سەری ئەدەبی کلاسیکمانن ، بەلاّم وەك وتمان دوکتۆر بەداخەوە ئەمەشی نەکردووەو مەگەر لە توێی فەرهەنگە گشتی‌یەکەیــدا هەندێ نموونەی‌وا بدۆزینەوە کە بەر ئەم بابەتە بکەون •• مەبەست لە ( فەرهەنگی کەسێك ) ئەوەیە ئەوکەسە هەندێ وشەی یا هەندێ ڕستەی بــە مەعنایەکی تایبەتی بەکارهێنابێ کــە مەعنای ڕاســتەقینەی خۆیان نــەبێ‌و لەگەڵ ئەوەشــدا بەهرەیەکی‌وای هەبێ بتوانێ ئەو وشەیە یا ئەو ڕستەیە بۆ ئەو مەعنا تایبەتی‌یە بگونجێنێ‌و کەسی‌تریش پێشتر لەوجۆرە بەکارهێنــانەی وشەو ڕستەکاندا ڕێگاکەی ئەوی نەگرتبێتەبەر • (فەرهەنگی‌کەسێك) بۆ کاری‌وا ڕێك‌ئەخرێ • فەرهەنگەکانی‌تر فەرهەنگی چەرخێك یا بەرەیەك یا قوتابخانەیەکی ئەدەبین ( وەك فەرهەنگی چەرخی فیکتۆری ) لە ئەدەبی ئینگلیزدا ، یا (فەرهەنگی سەدەی هەژدەهەم ) لە ئەدەبی ڕووسدا ، یا ( فەرهەنگی قۆناغی ڕۆمانسی ) لە ئەدەبی فەرەنسەدا ، یا ( فەرهەنگی ئەدەبی کلاسیکی ڕۆژهەلاّتی ئیسلامی) لە ئەدەبی گەلە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەلاتدا ، یــا ( فەرهەنگی زاراوەکانی ئەهلی تەصەووف ) لە ئەدەبی تاقمە فەلسەفی‌یە موسوڵمانەکاندا •• بەم‌جۆرە لە ئــەدەبی کوردیی خۆیشماندا کە شــیعری کەســێکی وەك ( مەحوی )

ئەخوێنینەوە ، فەرهەنگی زمـان ناتوانێ بگاتە فریامان بـۆ لێکدانەوەی وشەی‌یەکی وەك ( خەرابات ) کە لە ئەدەبی موتەصەووفەدا بەمەعنا (وێرانە) نی‌یەو ( مەیخانە )یە ، یا بۆ لێکدانەوەی وشـەی ( زاهید )و ( واعیظ )و (صۆفی)و ( شێخ ) کە مەبەست لە هەرکامیان کەسێکی تایبەتی‌یە نەك مەعنا زمانی‌یەکەیان کە لەوانەیە ماڵەولای شارەزوور بیزانێ .

ڕاستەکەی بەشـبەحاڵی نالی فەرهەنگێکی لە چەشـنێکی تایبەتیی پێویستە کە ئەوەش بە شێوەیەکی سەربەخۆو بێ‌بەستنەوەی وشەکان بـە بەیتەکانیەوە لەتوانادا نی‌یە . گیروگرفتی ڕێگای نالی زانین لە تێگەیشتنی مەعنای تاکە وشـەکانیا نی‌یە ؛ لە پەی‌بردن بـەو یاری بە وشـە کردن‌و وشـەئارایی‌و تەورییەو جیناس‌و لـە مەعنای نزیکەوە بۆ مەعنای دوور چوونانەدایە کە بە زیرەکی‌و وریایانەو بە شارەزایی‌یەوەو گەلێ‌جاریش بـە بێ‌پێویستی‌و تەنانەت بێ‌ئەوەش ببن بە هۆی بەخشینی مەعنایەکی تەواو ، کردوونی ، ئەنجا لە تێگەیشتنی ئاوو هەوای وتنی شیعرەکان‌و دۆزینەوەی هۆی وتنیاندایەو پاش‌ئەمانەش سەرە دێتە سەر لێکدانەوەی وشە بەگوێرەی فەرهەنگ کە ئەوەش دەورێکی ئێجگار ناچیز ئەگێڕێ . هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان خوێنەوار ناتوانێ لە ڕێگای فەرهەنگی دیوانی نالیی دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە بگاتە ئەوە بەیتێکی وەك :

**خورووجی ( با ) لە لوصووقیو ، ( عەلا ) لە ئیستیعلا**<br>**دوخوولی عەتبەیی ( عەن ) فاصیلە لە تیری جەفیو**

مەعنا لێ‌بداتەوە . من ئەم بەیتەم بۆنموونە هێنایەوە[27] ، ئەگینا تێکڕای قەسیدەکە کە نالی لەژێر پەردەیەکی ناسکی ( نەحو )ی عەرەبیدا کۆمەڵێ

(27) بۆیە نموونەم لەم قەسیدەیە هەڵبژارد ؛ چونکە تێکڕای قەسـیدەکە سەرگوزەشتەیەکی لەنێوان من‌و دوکتۆر مارفدا هەیە لە لاپەڕە ٢٠٤ ــ ٢٠٥ی دیوانی نالی‌یەکەی خۆماندا لێی‌دواوین‌و ، پاشانیش کە دێمە سەر باشەکی‌یەکەی دوکتۆر دیسان قـسەی لێ‌ئەکەمەوە .

واتای جینسی ‌ی‌شی تیا داوه به‌ده‌سته‌وه ، شـتێك نی‌یه بـه‌و مه‌عنا لێ‌دانه‌وه ده‌سـته‌پارچه‌و كولۆڵو بێ‌ده‌رامه‌تـه‌ی دوكتۆر مـارف بزانرێ • ئـه‌مه ڕاستی‌یه‌كه ئه‌گه‌ر كه‌سێك هه‌بێ نكوولیی لێ بكا ، ئه‌بێ به ناچاری بچێته ڕیزی ئه‌وانه‌وه كه له‌م چه‌رخی كاروانسه‌را له ئاسمانا دروست‌كردنه‌دا ، هێشتا سوورن له‌سه‌رئه‌وه كه زه‌وی ئاسووڕێته‌وه‌و ئه‌ستێره‌كان كۆمه‌ڵه بزمارێكی زیوینن به ساجی ڕه‌شی ئاسماندا كوتراون ••



هه‌روه‌ها دوكتۆر له‌م‌بابه‌ته‌دا نووسـیویه ئه‌ڵێ : « بـۆ دانانی ئه‌م فه‌رهه‌نگه ڕه‌چاوی ئه‌م شتانه‌ی خواره‌وه كراوه : (١) وشه‌و ڕسته‌كان بـه ئیملاو ده‌سـتووری نووسـینی كوردی نووسـراون وه‌كو ئیملای نـاو تێكسته‌كان ، ئه‌گه‌ر وشه یا ڕسته‌كه بێگانه بێ به‌تایبه‌تی عه‌ره‌بی‌و فارسی ، به ئیملای عه‌ره‌بی‌و فارسی به سه‌رو ژێره‌وه تۆمار كراوه » •

لێره‌دا ئه‌مه‌وێ بڵێم یـه‌كه‌م دوكتۆر به‌ده‌گمه‌ن ئـه‌م گفته‌ی خۆی به‌جێ‌هێناوه‌و ده‌یان وشـه‌ی عه‌ره‌بی له‌كتێبه‌كه‌یدا هـه‌ن ته‌نها بـه ئیملا كوردی‌یه‌كه نووسراون‌و سه‌دان وشه‌ی‌تریش هه‌ن هه‌رچـه‌ند به ئیملای عه‌ره‌بی‌ش نووسراون به‌ڵام هیچ سه‌روژێرێكیان بۆ نه‌كراوه• خۆ وشـه فارسی‌یه‌كان ئه‌وه هه‌ر هیچ نه‌هێنراونه‌ته‌وه سه‌ر ڕێنووسه فارسی‌یه‌كه‌یان مه‌گه‌ر به‌ده‌گمه‌ن• دیاره سه‌رو ژێر بۆكردنیشیان ، كه نه‌شكراوه ، هیچ ڕێی تێ‌ناچێ‌و كه‌س فارسـیی به سه‌رو ژێره‌وه نه‌نووسـیوه ، مه‌گه‌ر جاروبار وشه‌یه‌ك بۆ مه‌به‌ستی فێركردن سه‌روژێری بۆ كرابێ •

ئه‌مه سه‌ره‌ڕای ئه‌وه كه ده‌سكاری كردنی وشه‌ی عه‌ره‌بی‌و نووسینی به ڕێنووسی كوردی له‌گه‌ڵ وه‌رگێڕانی ئه‌و پیتانه‌یدا كه له كوردیدا ئه‌ڵێن نین ، به‌ش‌به‌حاڵی ئێمـه‌ی كورد كه هه‌م شـاره‌زای پیتی عه‌ره‌بین‌و هـه‌م

ڕاستەکەی گەلێ لەو پیتە عەرەبیانەش لە زمانەکەماندا جێی خۆیان کردووەتەوە . کارێکە کۆمەڵێ ئاڵۆزیی بەدەمەوەیە . کاتێ کە بنووسی کورد بێ (ظاهر)و ( زاهر ) هەر بە (زاهیر) بنووسێ ، یا (حارث)و (حارس) هەر بە ( حاریس ) بنووسێ ، یا (ظریف )و (نزیف) هەر بە (نەزیف) بنووسێو هەروا بەمجۆرە، دیارە ئەبێ بە مایەی سەرلێشێواندنێکی زۆر بۆ خوێندەوار . لەم مەیدانەدا شێوەی ڕاستی کار هەر ئەوەیە پیتی عەرەبی وەکو خۆی بهێڵرێتەوە بەڵام وشە بە ڕێنووسی کوردی بنووسرێ ، واتە ( ظاهر ) ببێ بە (ظاهیر)و (زاهر) بە (زاهیر)و (حارث) بە (حاریث)و (حارس) بە (حاریس)و (نظیف) بە (نەظیف)و (نزیف) بە (نەزیف)و .. تاد . بەمە هەم نووسینی کوردییشمان بۆ دابین ئەکرێو هەم پیتیش ناگۆڕێ و خوێندەواری کوردیش بەگوێرەی توانای خۆی ئەیخوێنێتەوە . مەسەلەی ئێمە وەك مەسەلەی ئەو گەلانە نییە کە بە پیتی لاتینی ئەنووسن کە هەر لەبناغەوە شارەزای پیتی ئەو دەنگانە نین کە لە زمانەکانی خۆیاندا نین . ئێمە لەبەرئەوە کە بە پیتی عەرەبی ئەنووسین شارەزای هەموو پیتە عەرەبییەکانین ، با دەنگی هەموویشیانمان لە زمانی خۆماندا نەبێ . ئێمە وەك هەموو گەلە موسوڵمانەکانیتر پێوەندێکی کولتووریی کۆنمان لەگەڵ عەرەب هەیەو لە ڕێگای ئەم پێوەندەوە ئەلفوبێی عەرەبی بووە بەموڵکی ئێمەیشو لەسەر ئەو بناغەیەشە ئەو هەموو دەسکارییەمان تیا کردووە تا لەگەڵ دەنگەکانی زمانەکەماندا بگونجێ . ئێمە ئەبێ لەبەرچی لەخۆڕایی دەس بەم خێرەوە بنێینو زمانەکەمان لە توانای نیشاندانی گەلێ دەنگ بێبەش بکەین ، کە ئەگەر نەشگەیشتبنە سەر زمانمان ، نیشانەکانیان لە زمانی بەکار هێنانی ڕۆژانەماندا جێی خۆیان کردووەتەوە ؟

دوا پرسیارم لێرەدا ئەوەیە مەبەستی دوکتۆر چییە کە ئەڵێ : «ئەگەر وشە یا ڕستەکە بێگانە بێ ، بەتایبەتی عەرەبیو فارسی » ؟ نالی لە وشەی

عەرەبیو فارسی بەولاوە . کام وشەی بێگانەی بەکارهێناوە ، ئەگەر دوکتۆر تاقە وشە تورکی‌یەکەی « گیل »مان لێ نەکا بە ماڵ ؟



دوکتۆر هەروەها لەمبابەتەدا ئەشلێ : « سەرو ژێری هەندێ تیپی وشەی عەرەبی لە فارسیو تورکیی عوسمانیدا وەکو یەك نین • ئێمە لێرەدا تەماشای لایەنی مۆسیقیی بزوێنەکەمان کردووە ، ئەوەی بە جوانترمان زانیوە ئەوەمان نووسیوە » •

زانینی چۆنیەتیی خوێندنەوەی وشەیەکی عەرەبی لە ئەدەبی کۆنی فارسیو تورکیی عوسمانیدا کارێکی ئاسان نی‌یە ، پێویستی بە گەڕانەوەیە بۆسەر فەرهەنگە فارسیو عوسمانی‌یەکانو هەڵسانو دانیشتنی دوورو درێژی لەگەڵ ئەدەبدۆستانی ئێرانو تورك پێ ئەوێ • بۆیە لاموایە دوکتۆر زۆر بەزەحمەت ئەتوانێ جۆری خوێندنەوەی ئەو وشانە لە فارسیو تورکیی عوسمانیدا دیاری بکا • بۆئەوەی ئێمە بتوانین سەرو ژێری ڕاست بەو وشانە بدەین ، پێویستە بزانین ئەدەب دۆستە کلاسیکی‌یەکانمان چۆنیان خوێندوونەتەوە • ئەگەر لەمڕووەوە گەیشتینە ئەنجامێك ، ئەوە باشە • ئەگینا ئەبێ بگەڕێینەوە سەر فەرهەنگە عەرەبی‌یەکانو خۆیان لەڕاستیدا چۆنن وایان بەکاربهێنین •



دیسان هەر لەمبابەتەدا دوکتۆر نووسیویە ئەڵێ : « هەوڵمانداوە لە فەرهەنگەکەدا هەموو ماناکانی وشەو ڕستەکان بخەینەڕوو • لێرەدا دیارە خوێنەر کە بەرەوڕووی هەموو ماناکان دەبێ ، دەتوانێ ئەو مانایە یا ئەو مانایانەی کە شاعیر مەبەستیەتی جودایان بکاتەوە • ئەمە لەلایەك •

نەلایەکی‌تریشەوە وشەو تەعبیرو ڕستەی نالی ئەوەندە مانایان زۆرە ، نەوەکو نە هەندێ جێگە ، بەڵکو گەلێ فەرهەنگی گەورە گەورەی‌تریش لە هەقی نایەن » .

پێشتر هەندێ لەم‌بابەتە دواین‌و ئەتوانین بڵێین کون‌و کەلەبەرەکانی ئەم کۆپلەی ئێرەشمان شی‌کردەوە . لێرەدا ئەوەندە زیاتر ئەڵێم کە ئەبوو دوکتۆر ئەگەر هەر ئەشی‌ویست هەموو مەعناکانی وشـەکان بخاتەڕوو ، هیچ‌نەبێ ئەوەی ڕوون‌بکردایەتەوە کە نالی کامیانی مەبەست بووە ، بۆئەوەی ئازادەیەك بۆمان ڕوون‌بێتەوە کەوا دوکتۆر خۆی چۆن لە مەعنای شیعرەکان گەیشتووە . ئەمەی کە دوکتۆر کردوویەتی هیـچ مەودای هاتنەدیی ئـەو مەبەستە پێویست‌و بەجێیەمان نـاداتێ . ئەمە لەلایەك . لەلایەکی‌کەشەوە پشت‌بەسـتن بە خوێندەوار خـۆی بـۆ دۆزینەوەی مەعنـای مەبەست‌و ڕاست‌کردنەوەی واتـای شیعرەکان ، واتە لێکۆڵەرەوە هـەر ئەوەندەی کردووە کەرەستەیەکی خاوی‌خستووەتە بەردەستی‌و ئیتر بەس ، کە ئەمەش بە هیچ جۆرێ بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە نادرێتە قەڵەم . سەرەڕای هەموو ئەمەو لەمە هەمووش سەیرتر ئەوەیە لە زۆر شوێندا دوکتۆر هەر بە جارێ مەعنای پێویست بەڵکو مەعنای ڕاستیشدا نەچووە . بۆنموونە (شـیرین قەلەم ) ڕاستە بە کەسێك ئەوترێ کە جوان بنووسێ یا خاوەن ئوسلووب بێ لە نووسیندا یا بەرهەمی شیعرو نووسینی نایابی هەبێ ، بەڵام نالی بۆ هیچ‌کام لەم مەعنایانەی بەکارنەهێناوە . ئەم کە ( شیرین قەلەم )ی بەکارهێناوە ، بۆ کەرەکەیی بەکارهێناوە . کەرو خەتی خۆش‌و ئوسلووبی جوان‌و بەرهەمی نایابی شیعرو نووسین لەکوێ یەك‌ئەگرنەوەو چی پێکەوەیان کۆئەکاتەوە ؟ دیارە ( شیرین قەلەم ) لە وەصفی کەرەکەی نالیدا کینایەیە یا لە چوارپەلی جوان یا لە ڕەخت‌و داڕشتنی شیرینی قەوارەی گوێرێژەکە کە دوکتۆر بـە هیچ کلۆجێ باسی لێ نەکردووە . یاخود ( مورغان ) کە دوکتۆر لەپێشیەوە

مەعنای ( مورغ )ی بە ڕاستی ، وەك لە هەر فەرهەنگێکدا نووسراوە ، لێکداوەتەوە ، کەچی نەیزانیوە (مورغان)یش جەمعی (مورغ)ەو بە هەموو ئاسانیەك‌و بێ‌ترسی هیچ لێ‌پرسینەوەیەك نووسیویە واتە : هێلکەی مریشك ، کە هەر ئەم هەڵەیەیە لە ( تەسبیحی مورغان )ەکەشدا خستوویەتیە هەڵەیەکی زلترەوە •



دوکتۆر خەزنەدار لە « دوا وشە »یشدا ئەڵێ « من ناڵێم نالی گەورەترین‌و مەزنترین شاعیری کوردە ، چونکە لە ئەدەبدا وەنەبێ وشەی « گەورە »و « گەورەتر »و «گەورەترین» شتێکی بەجێ بێ ، بەڵام ئەوەندە دەڵێم ئەو پلەیەی کە نالی گەیشتوویەتی لە شیعری کوردیدا پلەیەکە لەدوای ئەودا هیچ پلەیەکی‌تر نی‌یە • لەپێش نالی‌و لەپاش نالی‌و لەناو هەموو نەتەوەیەك‌و لە هەموو ڕۆژگارێکدا ، پلەی شیعری نالی لە جیهانی جوانی‌و هونەریدا بێ‌ناتەواوی‌یە » •

بەر لە هەرچی کێ وتوویەو لەکوێدا وتراوە « گەورە »و «گەورەتر»و « گەورەترین » لە ئەدەبدا شتێکی بەجێ نی‌یە ؟ مێژووی ئەدەبی هەر گەل‌و نەتەوەیەك تەماشا ئەکەی پڕە لە تەعبیری‌وا ، زیاد لەوە کە لە ڕاستی‌یشدا ئەدیبەکان پلە پلەن‌و بچووك‌و گەورەو بچووکترو گەورەتریان تیایەو تائێستا نەمان‌بیستووە کەس ڕەخنە لە وتەی‌وا بگرێ •• ئەنجا ئەگەر ڕاستە بڕینی ئەم صیفەتانە بە باڵای کەس لە جیهانی ئەدەبدا شتێکی بەجێ نی‌یە ، ئەی چۆن دوکتۆر خۆی وا زوو ئەڵێ «ئەو پلەیەی نالی گەیشتوویەتێ لە شیعری کوردیدا پلەیەکە لەدوای ئەودا هیچ پلەیەکی‌تر نی‌یە •• تاد » ؟ ئەی ئەمە مەعنای لە « گەورەترین » زیاتریش ناگەیەنێ‌و ، دوکتۆر چۆن هەستی بەم ناکۆکی‌و یەك‌نەکەوتنە ئاشکرایە نەکردووە لە قسەکانیا ؟

پاشانیش چۆن « لەپێش نالیو لەپاش نالیو لەناو هەموو نەتەوەیەکو لە هەموو ڕۆژگارێکدا پلەی شیعری نالی لـە جیهانی جوانیو هونەریدا بێناتەواوییە » ؟ دیارە من نامەوێ بۆ بەرپەرچدانەوەی قسـەی دوکتۆر قەدری نالی کەمکەمەوە • هەرچۆن بێ ئەوەی ئێمە بۆ نالیمان کردووە گەلێ زیاتر قەدری نالیی پێ بەرزتر بووەتەوە تا ئەم قسەیەی دە خەزنەدارو ئەوەی ئەو بۆی کردووەو ، بۆ فەخرکردنیشی نالێم •• بەڵام ئەم قسەیەی دوکتۆر ئەیکا قسەیەکی ( عیلمی ) نییە •• تەواوی ، وەك ئەڵێن ، هەر بۆ خوایە •• تەواوی بەپێی سەنگو تەرازووی ( عیلم ) شتێکی نیسبییە نەك موطلەق تا پێشو پاش سەردەمی نالیو لەناو هەموو نەتەوەیەکو ، دیارە لـە هەموو وڵاتێکو ، لە هەموو ڕۆژگارێکدا پلەی شیعری نالی لـە جیهانی جوانیو هونەردا ناتەواویی نەبێ ، کەچی ڕوویەکی ئەو ناتەواوی نەبوونەنش ڕوون نەکەیتەوە • ڕاسـتە نالی قوتابخانەیەکیوای بۆ شـیعری کوردی داهێنا ئەوانەی بەدوایدا هاتن کەسیان نەیتوانی پیا بگاتەوە تا قوتابخانەکە کەوتە سەر لێواری مەرگ ، بەڵام ئەمە هەرگیز واناگەیەنێ شیعری نالی ناتەواویی تیا نییەو ناشبێ وابگەیەنێ • بەداخەوە ئێرە مەودای لێکدانەوەیەکی درێژی ئەمبابەتەی تیا نییە ، بـەڵام با من بۆنموونە ناتەواوییەکی شـیعری نالی پیشانی دوکتۆر بدەم ، ئەوەش نەگونجاویی دابەشبوونی ( هەڵکشاوە )و لەنگەری وەستانەوەیە لە دواپیتی گەلێ بەیتیدا ، وەك لە قەسیدە درێژەکەیدا کە ئەم بەیتە سەرەتایەتی :

> نەلا ئەی نەفسی بووم‌ئاسا ، هەتا کەی حیرصی ویرانە !
> لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ بازانە ، ئازانە !

کە زۆر جار هەڵکشاوە لەسەر (ئەلف)ی دواییو ، زۆرجاریش لەسەر (حەرفی عیللە)ی پێش ئەلفی دوایییەوەیە •



دوکتۆر ئەم بابەتەی بەم ڕستەیە دوایی هێناوە : « ناڵێم کەس هێندەی من لەگەڵ نالیدا نەژیاوە ، بەڵام ئەوەندە دەڵێم کەمکەس دەتوانێ ئەوەندە لەگەڵ نالی بژی ئەوەندەی من لە گەڵی ژیاومو دەژیم » •

منیش هەر ئەوەندە ئەڵێم مایەی بەختەوەریە بۆ هەموان دوکتۆر دەرگای لەڕوودا دانەخستووینو ڕێگای ئەوەی داوین بەتەمای ئەوە بین ڕۆژێ لە ڕۆژان یەکێ بین لەو کەمکەسانەی ئەتوانن هاوشانی ئەو بن لەوەدا کە بتوانن ئەوەندەی ئەو لەگەڵ نالیدا بژین ، بەڵام صەد بریا ئەم عومرە درێژەی دوکتۆر لەگەڵ نالی بەسەریبردووە ، ئەوەندەی درێژیەکەی پانیش بوایە !



دوا بابەتی ئەم باسەی دوکتۆر کە پلارێکیشی تیا گرتووەتە کۆڕی زانیاری کوردو من ، «سوپاس»ەکەیەتی کە تیا ئەڵێ : « بەڵام ئەوکەسانەی تەگەرەیان دەخستە بەر ئەم کارە بەوەی کەرەستەو سەرچاوەو دەسنووسو بەیازیان لێ دەشاردمەوە لە نالی ناسانی هەندێ دەسگای زانستیی کوردیو ئەوانەی پێوەندییان بەوانەوە هەیە ، من لێیاندەبوورم • ئەگەر کەموکوڕی لەمکارەدا هەبێ ـ بێگومان هەیە ـ لە هەندێکیدا ئەوان بەرپرسیارن » •

ئاشکرایە مەبەست لە نالیناس ماموستا مەسعوود موحەممەدو لە دەسگای زانستیی کوردی کۆڕی زانیاری کوردو لەوانەی پێوەندییان بەوانەوە هەیە منو لە ڕێگای منیشەوە باوکمو کاکمە • بەڵام ئەم تاوانەی دوکتۆر باسی ئەکا تا چڕادەیەك ڕاستە ڕوویداوەو ، بەدوای ئەوەشدا لێبووردنەکەی ئەو تا چڕادەیەك ڕەوایە بە لێبووردنو چاوپۆشی لە خراپەو تاوان دابنرێ ، ئەوە ڕوونکردنەوەی ئەوێ •

لەوڕۆژەوە کە کۆڕی زانیاری کورد دامەزراوە (٢٨) دوکتۆر مارف شیرو تیری لێ ئەساوێو لەدژی ئەدوێو ئەنووسێ و خەڵکی لێ هان‌ئەداو هەوڵی ڕووخاندن‌و مراندنی ئەدا ، ئیتر هەرچەند ئەوە بە زیانی ئەو خۆیشی تەواو بێ وەك ڕۆشنبیرێکی کورد .. بۆیە بەدرێژایی ساڵانی بوونی کۆڕو خەریك‌بوونی دوکتۆر بە ئامادەکردنی دیوانی نالی‌و فەرهەنگی نالی‌یەوە ، ڕۆژێ لە ڕۆژان نە بە دەم‌و نە بە نووسین ، نە ڕاستەوخۆ نە ناڕاستەوخۆ داوای یارمەتیی لە کۆڕو ئەندامانی کۆڕو کارگێڕانی کۆڕو ئەوانەی لە کۆڕ کارئەکەن نەکردووە ، تا ئێستا مافی تاوانبارکردنیانی بێ ، بەڵام لێیشیان خۆش‌بێ ! هەرچی مامۆستا مەسعوود موحەممەدیشە ، ئەوە ماوەیەکی دوورو درێژ لە ڕێگای گفتوگۆی تایبەتی‌و بەرنامەی تەلەفزیۆنی کەرکووکەوە کە دوکتۆر مارف خۆی لە بەردەمیا دائەنیشت‌و بە وشەی ڕازاوەو ڕستەی پڕ قەدرو حورمەت پێشکەشی تەماشاکەرانی ئەکردو ئەویش بەناوی گفتوگۆکردنەوە بۆ خەڵك ، قسەی بۆ دوکتۆر مارف ئەکرد و هەزار شتی لەبارەی نالی‌و « جیهانی نالی »یەوە فێرکردو ئەمیش قوڕوقەپ لە بەردەمیا دائەنیشت گوێی ئەگرت.ئەمێنێتە سەر من‌و ئێمەیش کە پێشان ناومان لە کوولەکەی تەڕشدا لای دوکتۆر مارف نەبوەو ڕۆژێ لە ڕۆژان نە داوای یارمەتیی لێ کردووین‌و نە ئاگاداری کردووین کەوا خەریکی دیوانی نالی‌یە ، ئەوە هەر ئەوەندە بەسە بڵێم ئەگەر ڕاست‌بێ دوکتۆر لە ١ی نیسانی ١٩٧٥دا لە هەموو شتێکی کتێبەکەی بوویێتەوە ، ئەوا دیارە من لە نیوەی دووهەمی نیسانی ئەوساڵەدا لە مۆسکۆ گەڕامەوەو ئەگەر توانای یارمەتی‌دانی دوکتۆریشم بوایەو ئەویش داوای یارمەتیی لێ بکردمایە ، هەر بێ‌سوود ئەبووو هیچم پێ نەئەکرا بۆی ، چونکە ئەو وەك

---

(٢٨) ئەم باسە پێش دەرچوونی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆڕی زانیاری کوردو عێراق‌و سەریان‌و پێکهێنانی کۆڕێکی یەکگرتوو لە هەموویان نووسراوە .

خۆی ئەڵێ کتێبەکەی ئامادەکردبوو و لە دەستی ئەو دەرچووبوو .. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یارمەتیم هەر داو یارمەتی‌یەکەشم سوودی هەبوو .. هەروا ئەویش یارمەتیی منی داو یارمەتی‌یەکەی ئەویش سوودی هەبوو . ئێمە باسی ئەم یارمەتی‌یەمان لە لاپەڕە ۲۰٤ ــ ۲۰٥ی نالی‌یەکەی خۆماندا لە لێکدانەوەی پارچە شیعری :

**شەوی بەهاری جوانی خەوێ بو پڕ تەشویر**
**لە فەجری پایزی پیری بەیانی دا تەعبیر**

دا نووسیوەو پاشان جارێکی‌تریش ئەگەڕێمەوە سەر باسی ئەم یارمەتی‌یە .

لێرەدا پرسیارێکی سادە بەڵام زۆر بەجێ ڕاست ئەبێتەوە ، ئەویش ئەوەتە : ئەی خۆ دوکتۆر ئەیزانی چاپەکەی ئێمە لەپێش هینەکەی ئەو دەرئەچێ ، کەواتە ئەی ئەو بۆچی نەهات بۆ خزمەتی زانست لە ئێمە بپرسێ چیتان لایەو چیتان لانی‌یە ، تا ئەو چەند بەیتە زیادە کە هەیبوون بمانداتێ ، بۆئەوەی نوسخەکەی ئێمەیش ناتەواو نەبێ‌و ئەو چەند بەیتەی تیابێ ؟ .



## (٢)

وەك پێشتر باسم‌کرد دوکتۆر خەزنەدار چەند لاپەڕیەکیشی کردووە بە پاشکۆی کتێبەکەیەوە ، دوو لاپەڕەو نیوی بە عەرەبی‌یە ئەم ناوونیشانەی بۆ داناوە : « ديوان الشاعر الكردي نالي ( ١٨٠٠ ــ ١٨٥٦ ) ومعجم ديوان الشاعر » • کتێبەکەشی بەم‌جۆرە باس‌کردووە کەوا گوایە (بحث ودراسة وتحقيق ) •

من هەرچەند لە پێینی ئەم کتێبەوە چەند لاپەڕەیەکیشم بە عەرەبی نووسیوە پوختەی بابەتەکانی کتێبەکەم تیا دەرخستووەو و ئەمتوانی ڕەخنەی ئەم چەند لاپەڕە عەرەبی‌یەی کتێبەکەی دوکتۆریش بخەمە ئەوێ ، بەڵام لەبەرئەوەی کە ڕووی دەمم لە خوێندەوارانی کوردە ، وام بە باشتر زانی هەر بە کوردی لەو شتانەش بکۆڵمەوە کە دوکتۆر هەر بە عەرەبی وتوونی‌و بە کوردی نەیهێناونەتە ئاراوە ، بۆئەوەی خوێندەوارانی کورد باشتر بتوانن بەرهەمەکەی دوکتۆر لە هەموو ڕوویەکەوە شەنوکەو بکەنو بە ترازووی ڕاستی‌و زانستپەرستی هەڵی‌سەنگێنن •

نموونەیەکی ئەوشتانە ئەوەتە دوکتۆر ئەڵێ : « درس [ أي نالي ] المبادىء الأولية للقراءة والكتابة في مسقط رأسه » • بەڵام نالێ چۆنی بۆ دەرکەوتووە کەوا نالی لە ( خاك‌وخۆڵ ) فێری خوێندنو نووسین بووەو بەچیدا ئەزانێ ئەم کوێرەدێ‌یەی شارەزوور مەلاو فەقێی تیا بووە ؟ دیارە

من نامەوێ بڵێم ئەم قسەیەی دوکتۆر بێگومان ڕاست نی‌یە ، بەڵام پێسەلماندنی ڕاستی‌یەکەشی پێویستی بە بەڵگەو سەرچاوەیە . یاخود کە باسی مەلاکانی ئەو سەردەمەی قەرەداغ ئەکا ، ئەڵێ : « طبقت شهرتهم الآفاق » کە ئەمە هەرچەند بۆ چەند زانایەکی کوردیش بێ . دیارە نابێ بووترێ ، چونکە پێویستە هەمیشە ڕاستی لە هەرچی‌یەکی‌تر لەپێشتر بێ . بەڵێ ڕاستە قەرەداغی ئەو ڕۆژە مەلای چاك چاکی تیدا بووە ، بەڵام ئەمە زۆری جیایە لەوەی دوکتۆر ئەیڵێ‌و ، « طبقت شهرتهم الآفاق » لە زیادەڕەوی‌یە بێسەروبەرە ڕۆژەلاتی‌یەکانی جاران زیاتر نی‌یەو ئەبێ زانای ئەم چەرخە لێی بەدوور بێ ..

دوکتۆر هەر لەم باسەدا ئەڵێ : « من المرجح انه طاف اكثر المدن التي كانت تشتهر بعلمائها الاعلام وبمدارسها الدينية » بەڵام ناڵێ زوربەی شارانی کوێ‌و چۆن ؟ هەرچەند بە ڕستەی پاشەوەشیدا کە باسی ڕووخانی میرنشینیی بابانەکان ئەکا ، دیارە باسی لە گەڕانی فەقێ‌یەتی نی‌یەو ئەگەر ئەوەش بوایە هەر ئەوەندەی ئەتوانی صیفەتێکی ( الكردية ) بخاتە سەر (المدن)ەکە ، ئەویش بە بێ‌بەڵگە .. کەواتە ئەبێ مەبەستی دوکتۆر ئەوەبێ نالی کە کوردستانی بەجێهێشت ؛ ئەم گەشتەی کرد .. بەڵام لەم بەجێهێشتنەی کوردستانیدا ئەبێ کوێ‌و کوێ گەڕابێ ؟ ئەوە دیارە مەککەو مەدینەو دیمەشق‌و ئەستەموڵ چووە .. با ئێمەیش لە خۆمانەوە بڵێین لە ڕێگادا چووەتە بەغداو ، شارەکانی سەر ڕێگەی مەککە ـ دیمەشق ـ ئەستەموڵیشی دیوە . بەڵام ئەمەش هێشتا ئەم دەفری گەورەی (اكثر..)ە پڕناکاتەوە .. خۆ ئەگەر بشڵێین مەبەستی ئەوەیە تەنها مەککەو مەدینەو دیمەشق‌و ئەستەموڵ ( كانت تشتهر بعلمائها الاعلام وبمدارسها الدينية ) ؛ ئەوا ئاشکرایە ئەمەش ڕاست نی‌یەو شاری‌تری‌وا زۆر بوون لە وڵاتی موسوڵمانانداکە مەلاو قوتابخانەی بەناوبانگیان تیا بووەو دیارە نالی‌یش

نەیدیون .. ئیتر نازانم ئەم ( طاف اكثر المدن)ە لەکوێوە هاتو ، باسی عولەمای ئەعلامو مەداریسی دینی چی هێنایە ئاراوە ؟ دیارە ئەم بابەتە بابەتێکی ئەوەندە بەبایەخ نی‌یە ، بەڵام قسەی بێ‌بەڵگەو بەربەرەڵڵاش ، نەخوازەڵا لە جیهانی زانستو لەناو پڕۆفیسۆراندا ، شتێکی‌وا نی‌یە هەروا بەئاسانی قووت‌بچی‌و چاوی لێ بنووقێنرێ . لە هەمووش بەولاوە « من المرجح .. » بەرابەر بە چی‌و ئەی ( غەیرە مورەججەحەکە ) قسەی کێ‌یەو کێ وتوویەو لە کام لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەدا وتراوە ؟

لەبارەی پایەی هونەریی نالی‌یشەوە دوکتۆر ئەڵێ : « انه هو الذی اتی بابدع الصور وأجل المعانی وارفع التشبیهات وأجمل الاستعارات ، فأصبح شعره لیس من ارقی ما قیل باللغة الکردیة ، وانما دخل الادب الاسلامي من اوسع ابوابه » . دوکتۆر ئەم ڕایەشی لەوانە نی‌یە ڕەوابێ هەروا بەسەریدا تێپەڕین . نالی تەنها کەس نی‌یە کە وێنەی شاکاراتەو مەعنای سەنگین‌و شوبهاندنی بەرزو خواستنی جوانی هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە . پێش ئەویش و پاش ئەویش شاعیری‌تری‌وا بوون ، هەرچەند نالی لە هەندێ ڕووەوە ئەوانی بەجێ‌هێشتبێ . بەڵکو هونەرمەندیی نالی لەمەشدا نی‌یە . هونەرمەندیی نالی لەوەدایە کە یەکەم‌کەس بوو شیعری بە دیالێکتی کرمانجیی خواروو وت‌و عەرووضی عەرەبیی بەدەسکاری‌یەوە هێنایە ئەم دیالێکتەوەو لە کارەکەشیدا گەیشتە چلەپۆپەیەك کەس پاش خۆی پیا نەگەیشتەوە . داڕشتنی ڕستەکەی دوکتۆر مارف ناتەواوە . ئەبوو پاش‌ئەوە کە ئەڵێ « حیث لم تکن اللهجة الکرمانجیة لغة الشعر الکلاسیکی » بیوتایە « فهو اول من نظم الشعر الکردی في هذه اللهجة ، وفضلا عن ذلك فقد اتی فیه بابدع الصور .. الخ » . بەم‌جۆرە ڕستەکە تەواوو ڕاست ئەهات‌و بیناکردنی باسی هونەری شیعری نالی لەسەر ڕستەی پێشووی بێ‌کەلێن‌و کەلەبەر ئەبوو .. ئەنجا ئەگەر نالی ، وەك دوکتۆر مارف ئەڵێ ، « هو

الذی أتی بأبدع الصور•• الخ » ، که ئەمەش مەعنای تەنهایی نالی ئەگەیەنێ لەم مەیدانەدا ، ئیتر چۆن شیعرەکانی « من أرقی »ن‌و « أرقی »ی تەواو نین ؟ ئەمە ناکۆکی‌یەکە لە قسەکانی دوکتۆردا وادیارە خۆی پێی نەزانیوە ••

ئەنجا با منیش لێرەدا پرسیارێك بکەم : ئەگەر صـــوورەت‌و مەعناو تەشبیەو ئیستیعارە لای دوکتۆر مارف ئەوەندە بەبایەخن ، ئەی بۆچی پاشان کە لە پاشەکی‌یەکەیدا بەراوردی کارەکەی ئێمەو کارەکەی خۆی ئەکا ، وا بە بێ‌قابیلەت باســـی کارەکەی ئێمە ئەکاو هـــەموو ناوەڕۆکەکەی لەوەدا کۆئەکاتەوە کە ئیشارەتمان بـــۆ هەندێ ئایـــەت‌و حەدیث کردووە کە لـــە شیعرەکاندا هاتوون‌و ، موحەسسیناتە لەفظی‌یەکانمان پیشـــان‌داوە کە ئەم دووکارەش ، بە قسەی ئەو ، بە هەر مەلایەکی شارەزاو بە هەر دەرچوویەکی بەشی عەرەبیی کۆلێژەکانی ئەدەب‌و پەروەرشت ئەکرێ، کە خۆی سەرەڕای دوکتۆراکەی یەکێکیشە لەوانەو ، بەداخەوە پێیشی نەکراوە !

دوکتۆر هەر لەم باسەدا ئەڵێ « القسم الاول [ واتە : لە کتێبەکەی ] عرض وتحليل وتقييم لطبعات الديوان المختلفة والنسخ المخطوطة التى توفرت لدينا • وعلى ضوء هذه المصادر استطاع الباحث [ کە خۆیەتی ] ان يحقق الديوان وأن يعثر على عـــدد من القطع الشعرية وابيـــات منفردة لم تنشر سابقاً » • ڕاســـتەکەی دوکتۆر هیچ‌جۆرە ( عـــەرض )و ( تـــەحلیل )و (تەقییم)ێکی بـــۆ دەسنووسەکان نەکردووەو ، لـــە چەند دێڕێکی نیـــوەو ناتەواو زیاتری لەسەر تێکڕایان نەنووسیوە • تەحقیقی دیوانەکەشی وەك پێشتر باسمان‌کرد بە هیچ جۆرێ بـــە تەحقیق دانانرێ‌و لەوەندە زیـــاتری نەکردووە کە تێکســـتەکانی ( عەلی موقبیـــل )و ( گیو )ی هەڵبژاردووە ، بێ‌ئەوەی بڵێ بۆچی ئەو دوو تێکستەی هەڵبژاردووە [ بەڵام ئاشکرایە تەنها لەبەر ئاســـانیی خوێندنەوە هەڵی‌بژاردوون ] و بێ‌ئـــەوەی چەردەیەك لـــە جیاوازیی نوسخەکانی‌تر ، لە سنوورێکی ئێجگار تەسکدا نەبێ ، باس‌بکا ،

ئەویش هیی کەمێکیان • خۆ مەسەلەی بڵاوکردنەوەی هەندێ پارچەش کە بە قسەی ئەو لەوەوپێش بڵاونەکراونەتەوە ، ئەوە دەق لـەوە ئەچێ کە ئەڵێن « تا خاوەنماڵ دزی گرت ، دز خاوەنماڵی گرت » • ئەو پارچانەی ئـەو ئەڵێ بەر لەو کەس بڵاوی نەکردوونەتەوە ، دوو سێ تاقە بەیتی ناو چەند غەزەلو قەسـیدەیەك نەبێ ، هـەر ئەوانەن کە ئێمـە بەر لـە هەرکەس بڵاومانکردوونەتەوەو ئەویـش لە ئێمەی وەرگرتوونو خسـتوونیەتە ناو دیوانەکەی خۆیەوەو بۆ تێپەڕاندنی ئەم دەسدرێژیەیە مێژووی نادراسـتی ( ١ی نیسانی ١٩٧٥ )ی لە داوێنی پێشەکیی کتێبەکەیەوە نووسیوە تا بـە خەیاڵی خۆی بە خەڵکی بسەلمێنێ ئەو بەر لە ئێمە لە ئامادەکردنی کتێبەکەی بووەتەوە • ئێمە جارێکیکەش ئەم ڕاستیەمان ڕوونکردەوەو دیسانەوەش لە لێکدانەوەی پاشەکییەکەی دوکتۆردا دێینەوە سەری •

دوکتۆر هەروا ئەڵێ : « یستعرض الباحث تاریخ نشر شعره [ ای شعر نالی ] ودیوانه والدراسات التی انشئت للبحث في حیاته وشعره ، فیقرر ان مجلة « روژ کرد = شمس الکرد » کانت من أولی المصادر التی نشرت قسما من دیوان الشاعر عام ١٩١٣ » • لێرەدا منیش ئەمەوێ لە دوکتۆر بپرسـم ئەگەر ئەم گۆڤارە ( من أولی المصادر التی •• )یە ، ئەی ( أولی المصادر )ەکە خۆی کامەیە ؟ شێوەی زانسـتیانە لێرەدا ئەوەبوو دوکتۆر بنووسـێ : « وبمقدار ما نعلم ، فان مجلة ( روژ کرد ) هی اولی المصـادر التی نشرت شیئا من اشعار نالی » •

دوکتۆر هەر لەمباسەدا ئەشڵێ : « یشیر البـاحث الی القصائد التی نشرت باسم الشاعر وهی فيالحقیقة لیست من نتاجه ، ویثبت رأیه في هذا الموضوع بدلائل علمیة مقنعة » ئێمە پێشتر بەدرێژی لەم باسە کۆڵینەوە ، بۆیە لێرەدا هەر ئەوەندە ئەڵێم بـەداخەوە دوکتۆر ئەیەوێ ئـەم ئیدیعا بێبەڵگەیە بەسەر خوێندەوارانی عەرەبدا بسەپێنێ ، ئەگینا ڕاستەکەی وەك

لەوێ وتمان تاقە بەڵگەیەکی نە زانستیو نە نازانستیی نەهێناوەتەوە ، ئیتر چش لەوە کە ( موقنیع ) بێ یا نە •

هەر لەمباسەدا دوکتۆر ئەڵێ : « اما القســم الثانی من الکتاب فهو دیوان الشاعر • اعتمد الباحث في تقریره النهائي للنصوص الشعریة وتثبیتها علی مصادر کثیرة من طبعات الدیوان والمخطوطات الفریدة التی دونت في اوقات مختلفة في النصف الثانی من القرن التاسععشر واوائل القرن العشرین حیث یربو عدد تلك المخطوطات علی العشرین ، وکذلك اعتمد علی ما یحفظه المعجبونبالشاعر من شعره»•ئەو ڕستەیەی ئەم کۆپلەیەکە مەبەستمە لێیبدوێم ڕستەی دوایییەتی ، چونکە سەرەڕای ئەوە کە دوکتۆر لــە سەرەتاکەیدا هیچ باسێکی ئەو شیعرانەی نەکرد کە لە دەمی خەڵکی بیستوونو بەوجۆرە ڕاستی کردوونەتەوە ، من ئەوەشــی لێ ئەپرسم کەوا شتیوا لــە مەیدانی لێکۆڵینەوەدا چەند جێگای متمانەو باوەڕەو ئەوکەسانە کێنو بۆ ناویان ناهێنێ تا خوێندەوارانی کورد هەڵیانسەنگێننو بزانن ئاخۆ بۆ ئەوە ئەشێن لەمبارەوە پشتیان پێ ببەسترێ یا نە ؟ ئەنجا ئەم « یربو علی العشــرین »ە لەکوێوە هەڵقوڵی ؟ ئەو لە سەرەتاکەدا بە چاپو دەسنووسو بیستنو قاقەزی کۆنو شتیواوە هەژدە سەرچاوەی بۆ ڕیز کرا ، ئیتر کوێڕا لێرە هەر دەسنووسەکان لە بیست تێپەڕین ؟ ناشێ بێبەوێ دیسانەوە بماندات‌ەوە دەســتی پەراوێزی ژمارە (٤٥)ی سەرەتاکەی کە بێئەوەی هیچ نیشانەیەکی تیا پیشانبدا • وتی تیا کەوا پتر لە بیست نوســخە دیوانی دەســنووسی نالیی بەکارهێناوەو ئێمەیش لەوێ لەسەرمان نووسی ؟

دوکتۆر هەروەها ئەڵێ : « ان منهج الباحث في اختیار النص الصحیح هو اقرب تلك النصوص الی الجو الشعري للشاعر ، واما في حالــة وجود اختلاف بین نص ونص آخر او نصوص اخری فقد دون تلك النصوص في الحواشی ایضا • وحین کان الباحث یقف عند معنیین کلاهما في اســلوب

الشاعر . كان يقوم بتدوين الاول في المتن والآخر في الحاشية » • منيش ئەڵێم سەرەڕای ئەوە کە زۆر زەحمەتە هەروا لێی بسەلمێنین کەوا توانای دەس نیشان کردنی ( الجو الشعري للشاعر )ی هەیە ، ئەوەشی ڕاستی یە کەوا تێکستە جیاوازەکانی تری غەیری تێکستە هەڵبژێرراوەکەی لەبنەوە نووسیوەتەوە • نەك تەنها پتر لە بیست نوسخە بەڵکو تەنها دوو نوسخەش بگرین لە نوسخە چاپ یا دەستنووسەکانی دیوانی نالی، جیاوازی یان لەوە زیاتر تیایە کە دوکتۆر لە پەراوێزی چاپەکەی خۆیەوە نووسیویەتەوە • ئەنجا یەعنی چی : وەستان لەئاستی دوو مەعنادا ، تا یەکێکیان لەسەرەوەو ئەویان لەبنەوە بنووسێتەوە ؟ دوکتۆر کەی مەعنای شیعرەکانی لێکداوەتەوە تا شتیوا ڕاست بێ ؟ بشێ مەبەستی ئەوە بێ تێکستێك بە دوو جۆر دەستی دابێ و یەکێکیانی لە سەرەوەو ئەویانی لە خوارەوە نووسیبێتەوە ؟ ئەمە ڕێی تێ ئەچێ ، بەڵام ( تێکست )و ( مەعنا ) زۆریان لە یەك جیایە •

دوا کۆپلەی ئەم بەشەش ئەوەیە کە ئەڵێ : « اما القسم الثالث والاخير فهو معجم لديوان الشاعر ، يتناول شرح وتفسير جميع الكلمات والمفردات والمصطلحات والتعابير الشعرية التى وردت في النصوص » • پاشان ئەڵێ : « فالمعجم هو ليس لديوان نالى فقط، او لديوان الشعر الكلاسيكي الكردي، وانما يمكن الافادة منه حتى لتفسير جوانب مهمة في الادب الكلاسيكى للشعوب الاسلامية المختلفة ، بالاضافة الى كونه معجما لتفسير ديوان الشعر الكلاسيكى الكردي منذ بدايته والى نهايته التى تمتد الى مابعد الحرب العالمية الاولى » •

سەبارەت بەمەشی ئەبێ بڵێم یەکەم دەیان وشە لە دیوانەکەدا هەن دوکتۆر خۆی نەداوە لەقەرەیان ، چجای ئەوە ( شەرح )و ( تەفسیر )یان بکاتەوە • هەروەها گەلێ زاراوەو دەربڕینی شیعری هەن لەوانیش نەدواوە ، جگە لە مەعنالێدانەوە بە هەڵە یا بەجۆرێ کە مەبەستی نالی ئەوە نەبوە •

ئەنجا ئەم ئەركە قورسەی كە دوكتۆر خستوویەتیە ئەستۆی «فەرهەنگەكەی» ، گەلێ لەوە زیاترە بەو فەرهەنگە هەڵگیرێ ٠٠ پێشتر تاڕادەیەك لەم باسە دوامو ئێرەش جێگای ڕاستەقینەی نیە ٠ با لێی گەڕێین بۆ ئەوكاتەی كە بەسەر فەرهەنگەكە خۆیدا دێمو شیی ئەكەمەوە٠



## ( ٣ )

دوكتۆر له پاشه‌كیی كتێبه‌كه‌یدا نووسیویه ئه‌ڵێ : « ئه‌م كتێبه به‌شێكه له‌و به‌رهه‌مه‌ی كـه له‌ئه‌نجامی بیركردنه‌وه‌و خۆخه‌ریككردن بـه نالی‌یه‌وه هاتووه‌ته دنیاوه • ئه‌مه له ده‌ره‌وه‌و ناوه‌وه‌ی وڵاتدا بووه له سالی ١٩٦٣وه تا سالی ١٩٧٠ • دیاره مه‌به‌ستیش ژیان‌و وردبوونه‌وه‌یه لـه دنیای نـالی ، ئه‌گینا ناسین‌و خۆشه‌ویستی‌و گرفتاربوون به نالی ده‌گه‌ڕێته‌وه سه‌رده‌می منداڵیم‌و ناوی نالیم پێـش چوونه حوجره‌ی مـه‌لا عه‌بدوڵڵای مزگه‌وتی ناوبازاڕی هه‌ولێرو پێش قوتابخانه‌ی سه‌ره‌تایی یه‌كه‌می هه‌ولێر بیستووه»•

ئه‌نجا ئه‌ڵێ : « له سالی ١٩٧٠ به‌دواوه كاتێكی دیاركراوم بۆ هێنانه‌دیی ئه‌م كتێبه ته‌رخانكرد ، به‌ڵام له به‌هاری سالی ١٩٧٤ه‌وه تا به‌هاری ١٩٧٥ هه‌موو ده‌م‌و كاتێكم هه‌ر بۆ ئه‌مه ته‌رخانكردو له یه‌كی نیسانی ١٩٧٥دا له هه‌موو شتێكی بوومه‌وه » •

ئه‌گه‌ر وابێ كه دوكتۆر ئه‌ڵێ‌و له‌پێش چوونه قوتابخانه‌و فێربوونی ئه‌لف‌وبێوه ناوی نالیی بیـستبێ‌و تا ١٩٦٣ ناسـیبێتی‌و خۆشی‌ویستبێ‌و گرفتاری بووبێ ، كه دیاره ئه‌بێ ئه‌م نـاسین‌و خۆش‌ویستـن‌و گرفتاری‌یه‌ش لـه خۆ پێـوه خه‌ریـك كردنیـا دیاری بداو ، لـه ١٩٦٣وه تـا ١٩٧٠ خه‌ریـكی لێكۆڵینه‌وه بووبێ لـه ژیـانی نالی‌و وردبوونه‌وه لـه جیهـانی نـالی‌و ، لـه‌و سـاڵه‌وه تا ١٩٧٤ واتـه چـوار سـالی ڕه‌بـه‌ق ، وه‌ك

نووسـتن‌و خواردن‌و دەرزوتنـەوە ، ڕۆژی چەند سـەعاتێکیشی بـۆ چلەکێشـان لە ئەشکەوتی نـالیدا تەرخـان‌کردبێ‌و ، لە بەهاری ۱۹۷٤ یشەوە تـا بەهـاری ۱۹۷٥ تەنانەت دەرزی بە قوتـابی‌یەکانیشی نەوتبـێ‌و لـە هیچ چالاکی‌یەکی کولتووری‌و کۆمەڵایەتی‌یشدا بەشداریی نەکردبێ ، هەر خەریکی نالی بووبێ‌و بەرهەمی ئەم ماوە دوورو درێژەشی ئـەم کتێبـەی بەردەستمان بێ ، ئەوە دیارە بەداخەوە شتێکی ئەوتۆی نەکردووە • زانایەکی نالی‌زان ئەوەندە وەخت بە نالی‌یەوە خەریك بێ ، باوەڕ بکەن ئەبێ تەنانەت لە نالی خۆیشی نالی باشتر بزانێ •• کەچی دوکتۆر بەدرێژاییی ئەم هەموو ساڵە نە توانی جیاوازیی هەموو تێکستەکانمان بداتە دەستو، نە شیعرەکانمان بە ڕاستو دروستی بۆ بنووسێتەوەو ، نە مەعنایانمان بۆ لێ‌بداتەوەو ، نە فەرهەنگێکی کەم‌هەڵەمان بۆ ڕێك‌بخاو تەنانەت نە پێشەکی‌و پاشەکی‌یەکمان بۆ بنووسێ ئەو هەموو کون‌و کەلەبەرەی تیا نەبێ‌و ، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەم‌ئەرکانە بـە تەواوبوو دائەنێ •• ئەوەتە هەر خۆی لە پەراوێزی ئـەم ڕستەیەدا ئەڵێ : « بەشەکەی‌تر لێکۆڵینەوەیەکی فراوان‌و دوورو درێژە لە ڕوخسارو ناوەڕۆکی شیعری نالی ، هەروەها دیارکردنی جێگەی شاعیری مەزن لە ئەدەبی کوردی ؛ ڕەنـگە فراوانترین کتێبی کوردی بێ لەسـەر شـاعیرێك نووسـرابێتەوە » • بـەڵکو وەك خۆی لـە موحازەرەکەی ۱۹۷۸/۱/۲٤ ی کۆمەڵی کولتووری کوردیدا وتی ئەو لێکۆڵینەوەشی هێشتا پرۆژەو ( رؤوس اقلام )ەو لەدوای وەڵامی پرسیاری گەلێ لە بابەتەکانی ئەگەڕێ ••

دوکتۆر لەم باسەدا هەروەها ئەڵێ : « بێ‌گومان دەرچوونی ئەم کتێبە زۆر دواکەوت • لـەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئـەوە بزانرێ کە چاپی هەموو بەشەکانی ئەم کتێبە کۆتایی هاتبوو، بەتایبەتی پێشەکی‌و تێکستی شیعرەکان، کە چاپی « دیوانی نالی »ی مـەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس‌و فـاتیح

عەبدولکەریم‌و محەمەدی مەلا کەریم کەوتە دەستی خوێندەوارانەوە ٠ ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە ئەگەر تاقە وشەیەکیشی چاپنەکرایەو یەك دوو سالیتر ئەم چاپەم دواخستایە ، چاپەکەی ئەوان نەدەبوو بە سەرچاوەیەك بـۆ ئەم چاپە ، چونکە مەبەستی ئێمەو ئەوان لـە بلاوکردنەوەی دیوانی نـالی‌و ئوسلووبی بۆچوونمان بۆ مەسەلەکە لە یەکتری جیاوازە » ٠

بەر لە هەرچی ئەگەر ڕاست بێ ، وەك دوکتۆر ئەلێ ، چاپی هەموو بەشەکانی کتێبەکەی بەر لەوە تەواوبووبێ کە کتێبەکەی ئێمە بکەوێتە دەستی خوێندەواران ، ئـەبێ پەکی بلاوکردنەوەی لەسـەرچی کەوتبێ‌و بـۆچی ڕاگیرابێ ؟ هەروا ئەگەر ڕاستە چاپی هەموو بەشەکانی بەر لە بلاوبوونەوەی کتێبەکەی ئێمە تەواوبووە ، ئیتر ئەم « بەتایبەتی »یە بۆ چی‌یەو لەپای چی ؟ کتێب کە چاپی تەواوبوو ، تەواو ئەبێ‌و فەرقی پێشەکی‌و بابەتی بنچینەیی‌و پاشەکی لـەمەدا نی‌یە ٠ خۆ ناشـێ کتێبەکەی ئـەو وەك موحازەرەکانی مامۆستایانی زانـکۆ فۆرمە فۆرمە بە سـتێنسل لەچاپدرابێ‌و بەسـەر قوتابی‌یاندا دابەش‌کرابێ ! ئەنجا ئەگەر دوکتۆر بەڕاستیەتی‌و لەم قسانەی خۆی دوودڵ نی‌یەو سوورە لەسەر ئەوە کە هەموو شتێ لە (١)ی نیسانی ١٩٧٥دا تەواو بووەو چاپی هەموو بەشەکانی کتێبەکەی ، بەتایبەتی پێشەکی‌و تێکستی شیعرەکان ، بەر لە بلاوبوونەوەی کتێبەکەی ئێمە لەچاپدراوەو ، پرۆڤەی فۆرمەکانی کتێبەکەی ، با بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپیش بێ ، نەدیوەتەوە [ ئـەبوو دوکتۆر ئەمەشـی بووتایـەو ئـەم کەلەبەرەشـی پڕبکردایەتەوە ] ، ئەی پێم‌نالێن ئەم هەموو بابەتانە لەکوێوە هاتن کە لـە پێشەکی‌یەکەیدا باسیان لێ‌کراوەو هەموو هیی پاش ١ی نیسانی ١٩٧٥ن ؟ ئەی دوکتۆر چۆن لە ١ی نیسانی ١٩٧٥دا بەوەی زانی کە مامۆستا مەسعوود موحەمەد لە هاوینی ١٩٧٦دا « چەپکێك لە گوڵزاری نالی » بلاوئەکاتەوەو فلانە بابەت‌و فیسارە وتاری تیا ئەبێ ؟ ئەی بۆچی ژمارەی سپاردنی کتێبەکەی

به کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدا ، (۱۰۰۹)ی ساڵی ( ۱۹۷۷ )ە کە ئەمەش دوازۆژەکانی ئەو ساڵە ئەگرێتەوە ؟ ئەمانە هەموو پرسیاریوان مەگەر ئیدیعای کەرامەتی ئەولیایانە بە فریای وەڵامدانەوەیاندا بگا ئەگینا وەڵامدانەوەو خۆ لێ دەربازکردنیان لە وزەی بنیادەمبەدەرە٠باشە ئەگەر ڕاستە نوسخەکەی ئێمە بە هیچ کلۆجێ نەبوە بە سەرچاوە بۆ دوکتۆرو هیچی لێ وەرنەگرتووە ، با بفەرموێت پێمانبڵێ پارچە شیعری « لایقی مەخزەنی طەبعە هەموو کەنزی غەزەلم »و پارچە شیعری « قەدری من چەندە لەلای دەوڵەتی دنیایی دەنی »ی لە چنوسخەیەك وەرگرتووەو بفەرموێت ئەو نوسخانە ئێستا لای کێنو وێنەیەکیانمان بە زەنکۆگراف لە گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان »دا بۆ بلاوبکاتەوە ٠٠ با بۆمان باسبکا بۆچی ئەو دوو قەسیدەیە لە دەسنووسەکەیدا نەبوون کە پێشکەشی وەزارەتی ئیعلامی کردبوو ؟ بۆچی هیچ جیاوازییەك لەو دوو قەسیدەیەدا لە نوسخەکەی ئێمەو ئەودا نییە ؟

لە مەیدانی بەرپەرچدانەوەی ئەم ئیدیعایەی دوکتۆردا ، جێی خۆیەتی لێرەدا داوا لە خوێنەوارانی بەڕێز بکەم سەیرێکی لاپەڕە ۲۰٤و ۲۰۵ی چاپەکەی ئێمە بکەن ٠ لەویادا بۆ ئەمانەت باسی ئەوەمان نووسیوە کە تێکستی دەسنووسی پارچە شیعری « شەوی بەهاری جوانی خەوێ بو پڕ تەشویر »م لەگەڵ تێکستی لای دوکتۆر مارف بەراوردکردو بە تێکستی هەردولامان پارچە شیعرەکە بۆ هەردوکمان ڕاستکرایەوەو تێکستەکەی لای ئەو هەڵەی گەلێ لەوەی لای ئێمە زیاتری تیابوو ٠ ئەمە لە بەهاری ۱۹۷٦دا ڕوویدا لە ژوورەکەی دوکتۆردا لە کۆلێژی ئەدەبیات[1] ٠ وەك

(۱) لەو دانیشتنەدا کە بەراوردی ئەو دوو تێکستەمان تیا کرد ، بۆم دەرکەوت دوکتۆر بە لای ئەوەدا نەچووە کە ئەو پارچە شیعرە بەدیمەن پڕ لە ئیشاراتی عیلمی نەحوی عەرەبییە ، بە تەوریە کۆمەڵێ بابەتی جینسییشی تیایە ، تەنانەت دیمەنە ساکارە نەحوییەکەشی بۆ ساغنەکرابوەوە. مەعنای (خورووجی با لە لوصووق و عەلا لە ئیستیعلا)م

له پەراوێزی نوسخەکەی خۆیشماندا نووسـراوە ، ئێمە ئەو نوسخەیەمان تەنها لە یەك سەرچاوەوە دەست کەوتبوو و ١٩ بەیتیش بوو ، داوام لە دکتۆر کرد ئەگەر زیاتری لایە بمداتێ، دوکتۆر وتی لای منیش هەر ١٩ بەیت هەیە. کەچی ئێستا کە تەماشای تێکستی ئەم پارچە شیعرە ئەکەین لە نوسخەکەی هەردوکماندا ، ئەبینین لای ئێمە ١٩ بەیتەو لای دوکتۆر ٢٠ بەیتە . باشە دوکتۆر بۆ وتی منیش هەر ١٩ بەیتم لایەو ، ئەو تاقە بەیتەی بۆ نەدامێ ؟ ئەنجا ئەگەر نوسخەکەی ئەو ڕاستە زووتر چاپی تەواو بووبوو ، ئەی ئەو ئەندازە هەڵەیەی چۆن ڕاستکردووەتەوە کە لە دەسنووسەکەیدا هەبوون‌و ئێستا لە چاپەکەیدا نین ؟ ئەمەش بەڵگەیەکی‌ترە کەوا ئەم ئیددیعایەی دوکتۆر ڕاست نی‌یەو ، خۆزگە خۆی پێشتر بیری بکردایەتەوەو ئەم گەرداوەی بۆ خۆی سازنەکردایە .

ئەنجا تو خوا چی ئەبوو ئەگەر دوکتۆر کەڵکی لە نوسخەکەی ئێمەش وەرگرتایە ؟ تۆ بڵێی هەر نەبێ .. نەبێ .. نوسـخەکەی ئێمە بەو هەموو سەرچاوانەیەوە ئەوەندەی چاپەکانی مامۆستا گیوی ڕەحمەتی‌یش کەڵکی نەبێ ؟ یان بشـێ ئەگەر دوکتۆرێك کتێبی چەند کەسـێکی پەروەردەی مزگەوت بـکا بە سەرچاوە بـۆ ( کارە عیلمی‌یـەکانی خـۆی ) ، ڕەنگی دوکتۆراکەی کاڵ ببێتـەوەو چوارچێوەی دیپلۆمەکەی بەربێتەوەو ، لـە دەوڵەتدا بەڵگەنامەکەی بۆ موعادەلە نەکەن‌و مانگانەکەی کەم‌کەنەوە ؟

---

لێ پرسی ، بۆی نەئەهات وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە . منیش خۆم وا خسـتە بەرچاوی کـە هیچی لێ نـازانم ، وتی کەواتـە لـە دوکتۆر مهدی‌المخزومی ئەپرسین کە پسپۆڕی نـەحوە بزانین پێـوەندی ( با )و ( لوصووق )و ، ( عەلا )و ( ئیسـتیعلا ) چی‌یەو یـەعنی چی ؟ ئەوجا من پێم‌وت پێویست بە پرسین ناکاو ئەفتێ لە سەرەتای چوونە حوجرەیاندا لە کتێبی ( عەواملی جورجانی )دا ئەخوێنن کەوا ( الباء للالصاق نحو بهِ داءٌ )و( علی للاستعلاء نحو زیدٌ علی السطحِ ) .. و تەوریبەکەشم بۆ لێکدایەوەو ، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو .

له لایه‌کی‌که‌شه‌وه ئه‌لێم له‌وانه‌یه دوکتۆر به ڕاستی بێ هیچ که‌لکی له کتێبه‌که‌ی ئێمه وه‌رنه‌گرتبێ‌و نه‌یکردبێ به سه‌رچاوه بۆ خۆی ⋅⋅ ئه‌گینا هیچ نه‌بێ نه‌ئه‌که‌وته ئه‌و هه‌ڵه زلانه‌وه له مه‌عنای هه‌ندێ وشه‌دا که تێی‌که‌وتووه ⋅⋅ ئه‌گه‌ر سه‌یری نوسخه‌که‌ی ئێمه‌ی بکردایه حاڵی ئه‌بوو شیعره تورکی‌یه‌کان تاقه غه‌زه‌لێك نین ، غه‌زه‌لێك‌و فه‌ردێکن ⋅⋅ مه‌عنای ده‌یان وشه‌ی وه‌ك (ته‌سبیحی مورغان)و (شیرین قه‌له‌م)ی لێ تێك‌نه‌ئه‌چوو⋅⋅ ( مورغان )و ( مورغانه )ی فارسیی لێ‌نه‌ئه‌بوو به یه‌ك ⋅⋅⋅ ( ته‌زبیێحی هێلکه مامر )و (که‌ری خه‌ت‌خۆش‌و شاعیرو نووسه‌ر )و ( بازی‌وا چاوی له چاوی باز بچێ )و گه‌لێ شتی‌وای دانه‌ئه‌هێنا که له قوتووی هیچ عه‌تارێکدا ده‌ست‌ناکه‌ون ⋅⋅

له‌باره‌ی جیاوازیی مه‌به‌ستی ئێمه‌و دوکتۆریشه‌وه له بڵاوکردنه‌وه‌ی دیوانی نالی‌و ئوسلووبی بۆچوونیشماندا ، که ئه‌و ئیددیعای ئه‌کاو به بێ هیچ جۆره پێوه‌ندی‌یه‌کیش ئه‌یکا به بیانوو بۆئه‌وه که چاپه‌که‌ی ئێمه نه‌بوه به سه‌رچاوه بۆ ئه‌و ، ئه‌وه هه‌ر ئه‌وه‌نده ئه‌ڵێم مه‌به‌ستی ئێمه ته‌نها ئه‌وه بووه شیعری نالی کۆبکه‌ینه‌وه‌و ئه‌وه‌نده‌ی له وزه‌و توانامان‌دا بێ ڕاستی‌که‌ینه‌وه‌و به ڕاستی‌و مه‌عنالێ‌دراوه‌یی بیخه‌ینه به‌رده‌ستی خوێنده‌وارانی کورد ⋅⋅ لاشم‌وایه تاڕاده‌یه‌ك ئه‌م مه‌به‌سته‌مان بۆ هێنراوه‌ته‌دی ⋅ جا ئه‌گه‌ر دوکتۆر مه‌به‌ستێکی‌تری پێچه‌وانه‌ی ئه‌م‌مه‌به‌سته‌ی ئێمه‌ی بووبێ ، ئه‌وه من نازانم⋅⋅ به‌ڵام خوا هه‌قه تا ڕاده‌یه‌کی باش ئه‌نجامێکی له‌م‌چه‌شنه‌ی ده‌سگیر بووه ⋅

دوکتۆر له ڕوون‌کردنه‌وه‌ی جیاوازی‌یه‌کانی کاره‌که‌ی ئێمه‌و خۆیدا ، چه‌ند خاڵێکی نووسیوه ، له یه‌که‌میاندا ئه‌ڵێ : « من به ئیملایه‌ك تێکستی شیعره‌کانم تۆمارکردووه ده‌توانم بڵێم ترانسکریپتی شیعره‌کانی نالی‌یه ، به ئه‌لفبایه‌کی زانستی له‌سه‌ر بنچینه‌ی تیپی عه‌ره‌بی ⋅ ئه‌گه‌ر له دواڕۆژدا ئیملای ستانداردی ئێستای زمانی کوردیش بگۆڕێ ، ئه‌م ئیملایه‌ی ئێمه ، وه‌کو

ئیملایەکی زانستی ، لە کەڵك ناکەوێ • بەڵام ئـەوان جۆرە ئیملایەکیان بەکارهێناوە ، ئەو دەسگایە داینـاوە نەبێ کەسی‌تر دانی پیا نەهێناوە » •

بـا بڵێین ئیملاکەی دوکتۆر لەوجۆرەیە کە خـۆی‌ئەیڵێ ، کە دیارە واش‌نی‌یە ، وەك لە تێکستی شیعرەکاندا چەند نموونەیەکی پیشان‌ئەدەین•• بەڵام ئەی ئەو ئیملایەی کە ئێمە بەکارمان‌هێناوە چۆن ئیملایەکە ؟• بێ‌گومان نە ڕێنووسی فارسی‌ئامێزی کۆنی کوردی‌یە کە خوێندەواری ئەمڕۆ بۆی ساغ‌نەکرێتەوەو نە هێرۆگلیفی‌و فینیقی‌یشە تا پێویـسـتی بە پسپۆڕەکانی ئاسەوارناسی بێ • ئەگەر لە هەندێ شتدا لە ڕێنووسەکەی دوکتۆر جیا بێ، خەڵك هەر ئەیزانن‌و ئەو هـەموو خوێندەوارەی کە کتێبەکەمانیان دیوە کەسیان نەیوتووە بۆمان نەخوێنراوەتەوەو تەگەرەمان تیا هاتووەتە ڕێ ••

بەڕاستی ئەبوو دوکتۆر خۆی لە قەرەی ئەم بابەتە نەدایە • ئەوێ کە مەگەر بەدەگمەن ئەگینا فاریزەیەك ، شاریحەیەك ، ئەداتێکی تەعەجوب ، نوختەیەك ، ئەداتێکی ئیستیفهامی نەخستبێتە سەر شیعرەکان ، کە خۆیشی دیارە زۆر چاك شارەزای ئەوەیە کەوا ئەم نیشانانە چ‌دەورێکیان هەیە بـۆ یارمەتی‌دانی خوێندەوار بۆ حاڵی‌بوون لە تێکست ، ئەبێ بە چی‌یەوە شانازی بە پوختی‌و ڕاست‌و ڕەوانیی ئیملاکەیەوە بکا ؟ بە نەبوونی ئەمانەوە ، یا بە نەنووسینی ئەو تیپە ئیشباعی‌یانەوە کە سەنگی بەیتیان پێ ڕاست‌ئەکرێتەوە، یا بەوەوە کە لە چەند شوێندا دوو وشەی کردووە بە یەك وشەو ، یەك وشەی کردووە بە چەندکەرتەوە،لەگەڵ‌ئەوەشدا کە نوسخەکەی ئێمەی لە بەردەستدا بووەو ئەیتوانی ، نەك وەك ئێستا نیوەو ناتەواو ، بەڵکو بەپێی پێویست کەڵکی لێ وەربگرێ !

سەبارەت بەوەیش کە ئەو ئیملایەی ئێمە بەکارمانهێناوە ، لەو دەسگا بەولاوە کە داینـاوە ـــ کە کۆڕی زانیاری کوردە ـــ کەس دانی پیا «ناهێنێ»،

به پێویستی ئەزانم لەپێشا کورتەی ئەم ڕێنووسەی کۆڕ بنووسمەوە ، بۆئەوەی خوێندەوارانی کورد ، کە زۆریان بە باشی ئاگایان لێ نی یە ، بین بە سەرپشك‌و بتوانن بڕیارێك بدەن لە ویژدان‌و ناخی دەروونیانەوە هەڵقوڵابێ .

ئەتوانین ڕێنووسی ناوبراو لەم ٢٠ بڕگەیەدا کۆبکەینەوە :

(١) ئەو دەنگانەی لە ڕێنووسی کۆندا تەنها بە (و) دەرئەبڕران ، بە (و)و (ۆ)و (ۊ) دەربـبڕرێن .

(٢) ئەو دەنگانەی لە ڕێنووسی کۆندا تەنها بە (ی) دەرئەبڕران ، بە (ی)و (ێ)و (ێ) دەر ببڕرێن .

(٣) دەنگی (ھ) لە کۆتاییی وشەدا ، ئەگەر دەرنەئەکەوت ، ئەوە بە (ە) بنووسرێ وەك : (ئـەمە) . ئەگەر دەریش‌ئەکەوت وەك لە وشەی (دەھ)دا ، ئەوە بە (ھ) بنووسرێ . هەروا لە وشەی بێگانەی وەك : (بەنی بووەیھ)دا .

(٤) چوکلەی (ر)ی قەڵەو بەسەریەوە بنووسرێ ، بەم‌جۆرە : (ڕ) .

(٥) وشەی (چی)و (چ) لە نووسیندا نەنووسێنرێن بە وشەی پاشەوەیانەوە ، تەنها لە حاڵێکدا نەبێ کە پاشەوەیان ضەمیری موتتەصیل بێ وەك لە (چما)دا .

(٦) تیپی (د)ی سواوی ئەو ژمارانەی ئەم تیپەیان تیایە لە ١١وە تا ١٩، زیندوو بکرێتەوە وەك ( یازدە .. ) تاد .

(٧) ناوی بێگانە یا بە ئیملای کوردی بنووسرێ ، یا بخرێتە نێوان دوو کەوانەوە .

(٨) تیپی (ت)ی پاش (ل) کە هەندێ‌کەس وەك (ط)ی ئەخوێننەوە ، هەر بە (ت)بنووسرێ ، بەڵام ئاگاداریی ئەوە بکرێ کە نیشانەی سەر (ل)کە لەبیرنەچێ ، وەك ( سەڵتە ) .

(٩) وشەی داتاشراوی وەك ( ژێزمان ) بە یەك پارچەیی بنووسرێ •

(١٠) وشەی ( ئەم ) کە ئەچێتە سەر وشەیەك لەگەڵ وشـەکە خۆی بنووسرێ وەك ( ئەمساڵ ) •

(١١) وشەی دەسـکاری‌کراو ببرێتەوە سـەر بنجەکەی • بۆنموونە (پەن) بە (پەند)و (وشیار) بە (هوشیار) بنووسرێ •

(١٢) کە ئەداتی نەفی‌و نەهی‌و ئەمرو موضارەعە ئەچنە سەر فیعل ، یا کە ضەمیری موتتەصیل ئەچێتە ناو فیعلەوە ، هەموو پێـکەوە بنووسرێن ، وەك ( نایخۆم ) •

(١٣) کە ئەداتی نەفی‌و نەهی‌و موضارەعە کەوتنە نێوان پێشـگرو فیعلی مورەککەبەوە ، پێشگرەکە بەتەنها بنووسرێ وەك ( هەڵدەگرم ) • هەروەها ئەگەر پتر لە ئەداتێـك کەوتە نێـوان پێشـگرو فیعلـەوە وەك ( هەڵنـەدەگرت ) • بـەڵام ئەگەر ئـەداتی ( ب ) لەنێـوان پێشـگرو فیعلدا سوابوو ، ئەوە پێشگرو فیعلەکە بنووسێنرێن بەیەکەوە وەك (هەلگرە) کە ئەسڵەکەی ( هەڵبگرە ) بووە •

(١٤) ناو ئەگەر لە دوو وشە پێکهاتبوو وەك (دڵشاد)و (گوڵزار) کە ناوی کەسێ بن یا وەك (سەیسادق)و (بانییی) ئەوە هەردو وشەکە بەیەکەوە ئەنووسرێن • هەروا هەر وشەیەکی دوو کەرت کە بـە هەردوو کەرتەکەی یەك مەعنا ببەخشێ وەك ( جلدروو )و ( نالبەند ) • بەڵام ئـەگەر مەعنای هەردوو وشەکە بە جیا جیا مەبەست بوو ئەوە بە جیا ئەنووسرێن وەك (کچە لەچك سوورەکە ) • وشەی دووکەرتی‌یش کە کەرتێکی پێشگر یا پاشگر بێ ، بە یەك پارچە ئەنووسرێ وەك ( کڕیار )و ( باڵدار ) •

(١٥) هەندێ وشە هەن لـە دوو پارچەو (و)ێکی عەطف پێکهاتوون‌و مەعنای پارچەی دووهەمیان وەك هیی پارچـەی یەکەمیـان وایـە ، وەك

( گفتوگۆ )و ( گورجوگۆڵ )و ( پێوقەدەم ) ، ئەوانە هەموو بە یەك پارچە ئەنووسرێن •

(١٦) بەڵام (و)ی عەطفی ناو ڕستە یا هیی عەطف‌کردنەوەی موفرەدێکی جیا بۆ سەر موفرەدێکیتر وەکو ( ژن و پیاو ) ، هەروەها (وە)ی عەطفیش، ئەوانە بە جیا ئەنووسرێن •

(١٧) صیفەتی وەك (تر)و (کە)و (دیکە) بە جیا ئەنووسرێن وەك (پیاوێکیتر) •

(١٨) بەڵام (تر) کە ئەداتی تەفضیل بێ ئەوە لەگەڵ وشەی پێشووی ئەنووسرێ وەك ( جوانتر ) •

(١٩) تیپی (ی)ی ئیضافە یان وەصف کە لەپاش (ی)ی کراوەوە بێ ، لەگەڵ پێشووەکەی ئەنووسرێ وەك ( هاوڕێی من ) • ئەگەر لەپاش (ی)ی درێژیشەوە بێ ، نانووسرێو تەنها (کەشیدە)ی سەر (ی)کە نیشانەی ئەویشە وەك ( ترۆزێ ناسك ) •

(٢٠) ئەداتی (دا)و (ڕا) ئەلکێنرین بە پێشەکەیانەوە وەك ( لە گیرفانمدا) • [٢]

وەك سەرنج‌ئەدەین ئەم ئیملایەی کۆڕ وەنەبێ شتێکی ئەوەندە نامۆ بێ لە جیهانی نووسینی کوردی • بەر لەوەش کە کۆڕ ئەم ڕێنووسە دانێ ، بنووسانی کورد لەخۆیانەوە زۆر لە بڕگەکانییان پێڕەوی کردووەو ئێستایش پێڕەویی ئەکەن • ئەوەی تاڕادەیەك خەڵکەکە هۆگری نەبووبن‌و لایان تازەو قورس بێ کەشیدەی سەر (و)و (ی)کەیە • بەڵام ئاخۆ ئەبێ ئەم

---

(٢) بۆ زانینی پتر لەبارەی ڕێنووسی کۆڕی زانیاری کوردەوە ، بڕوانەرە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٢ ، لاپەڕە ٣٦٤ ـ ٣٧٩ . هەروەها بڕوانەرە : مەسعوود محەمەد ، ڕێنووسی کۆڕ ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی چوارەم ، ١٩٧٦ ، لاپەڕە ٢٣٢ ـ ٢٨٤ .

کەشیدەیە چیی جیابێ لەو کەشیدەیە کە مامۆستا تۆفیق وەهبی لەسەر تیپی ( ۆ )ی داناوە لە جێگەی (و + ێ)دا ، وەك لە وشـەی ( خوێندەوار )و (گوێ)دا کەئەنووسێ ( خۆندەوار )و (گۆ)و ، ئـەڵێ ئەمـە دەنـگێکی تایبەتی‌یەو دەنـگی (و)و ( ێ ) نی‌یە ، وەك چۆن کورد لە ( یوسـف )و (یونس)یشدا ئەڵێن ( وێسف )و ( وێنس ) •• دوکتۆر خەزنەدار خۆیشی لەمێژە بە چاولێکەریی مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەم ڕێچکەیەی گرتووەو لەم کتێبەیشیدا لەسەری ڕۆیشتووە •

مەبەستی من لەم داکۆکی‌کردنە لە ڕێنووســی کۆڕ ئەوە نی‌یە بڵێم ڕەخنەی لێ ناگیرێ‌و گەردی لێ نانیشێ • من خۆم بەرابەر بە هەندێ بڕگەی ئەم ڕێنووسە باری ســەرنجی جیاوازی خـۆمم هەیەو ، هەر بۆیەش بـە بەراوردێکی بڕگەکانی ئەم ڕێنووسەو ڕێنووسی نالی‌یەکەی ئێمەدا بەئاشکرا دەرئەکەوێ لە زۆر شتدا شوێنی ڕێنووسی کۆڕ نەکەوتووین تیادا • بەڵام دوکتۆر مارف کە مەبەستی یەکەمی ئەوەیە بە حەق و ناحەق لـەدژی کۆڕ بدوێ ، خۆی بەوەوە ماندوو نەکردووە بزانێ ئاخۆ ڕێنووسی کۆڕ چۆنەو چۆن نی‌یەو ، تا چڕادەیەك ئێمە لە نالی‌یەکەمـاندا بەپێی ئـەو ڕێنووســە جووڵاوینەتەوە • هەروا لەخۆیەوە داویەتەبەری ، حوکمێکی نادروستی ، بە شێوەیەکی نادروست ، کردووە بە بەڵگە بۆ ئیددیعـایەکی نادروســت کە ئەوەتە کتێبەکەی ئێمە نەبوە بە سەرچاوە بۆ کارەکەی ئەوو ، بۆ خــوێی چێشتیش کەڵکی لێ وەرنەگرتووە ! ••

جیاوازیی دووهەمی مەبـەستی ئێمەو دوکتۆر مـارف لە مەبەست لە بڵاوکردنەوەی دیوانی نالی‌و ئوسلووبی بۆچوونماندا ، وەك ئـەو ڕوونی ئەکاتەوە ، لەم بڕگەیەدا دەرئەکەوێ کە ئەو نووسیویەو تیا ئەڵێ :

« ئەوان دێڕ دێڕ شیعرەکانیان لێکداوەتەوەو شی‌یان کردووە ، لەمەدا بەلای ئێمەوە دوو نهێنیی دنیای شیعری نالی‌یان ئاشکرا کردووە ، یەکەمیان

دەست‌نیشان کردنی ئەو ڕەمزو ئیشارەتەی بـۆ ئایەتی قورئان‌و حەدیثی پێغەمبەر لە شیعرەکاندا هاتوون • دووەمیان پیشاندانی ئەو موحەسـەناتی لەفزی‌یەیە کە لە شیعرەکاندا بەکارهێنراون • دیارە ئەم دوو لایەنەی شیعری کلاسـیکی بە مەلایانی شـارەزاو دەرچووانی بەشـی زمانی عەرەبی لە کۆلێجەکانی ئەدەبیات‌و پەروەردەو هیی‌تر بـە بێ‌ئەرکێکی یەکجار زۆرو گران دێتەدی • بەڵام بە لای ئێمەوە لە هەموو شتێك گرنگتر ساغ‌کردنەوەی تێکستی شیعری نالی‌یە ، ئەویش نەك دەست‌نیشان کردنی ئەو جیاوازی‌یانەی لە تێکستی دەسنووس‌و دیوانە چاپکراوەکاندا هەیە ، چونـکە زوربەی جیاوازی‌یەکان هەڵەی نووسینەوەی ناشارەزایی‌یانەی ئـەو خەڵکە نیمچە خوێندەوارەیە کە دەسنووسەکانیان ڕوونووس کردووە • ئەوجا پێویستە بایەخ بە فەرهەنگی نالی بدرێ • بۆیە ئێمە ئەم ڕێگەیەمان گرتەبەر • ڕاستە ئەم فەرهەنگە بەتەواوی نالی ڕوون‌ناکاتەوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە هەموو وشەیەکی تێکسـتی نالی ڕوون‌دەکاتەوە نەك تەنیا ئـەو مانایانەی نـالی مەبەستیەتی بەڵکو هـەموو ماناکانی‌تریش • ئیتر پێویسـتە خوێندەوار شارەزایی‌و زانایی خۆی بەکاربهێنێ بۆ تێگەیشتنی شیعرەکە • ئەمە پلەیەکی گرنگەو کەمتر تەنگ‌و چەڵەمە دروسـت‌دەکاو دەبێ پێـش لێکدانەوەو شی‌کردنەوەو شەرح‌کردن بکەوێ » •

وەك دیمان دوکتۆر لـەم بڕگەیەدا لە گەلێ شـت دوا کە هەموویان شایانی پیاچوونەوەو شی‌کردنەوەن • دوکتۆر ئەیەوێ بلێ ئێمە نەمانتوانیوە لە سنووری دیاری‌کردنی ئەو ئایەت‌و حەدیثانەی نالی ئیشارەتی بۆ کردوون‌و ئەو موحەسـسیناتە لەفظی‌یانەی کە لە شیعرەکانیدا هەن ، دەربچین‌و ئـەو کارەی کردوومانە کارێکی ئاسان‌و بێ‌مەینەتە بـە هەر مەلایەك‌و بە هـەر دەرچوویەکی کۆلێژەکانی ئەدەبیات‌و پەروەرشت ؛ لەوانەی ئەو تائێستـا چەند وەچەی لێ دەرکردوون‌و بڕوانامەی بۆ مۆرکردوون ــ ئەکرێ • دیارە

ئێمە مەعنای قسەکەی دوکتۆر لێ ئەدەینەوە، ئەگینا بە هیچ لۆجێ مەبەستمان بە کەم زانینی مەلاو دەرچووانی کۆلێژی ئەدەبیاتو پەروەرشت نی یە ، وەك ئەو لە ڕێگای بێ نرخ کردنی کارەکەی ئێمەوە کردوویەتی . بەڵام ئاخۆ دوکتۆرێ کە تەنانەت نە ئیشارەتی بۆ ئەو ئایەت و حەدیثانەش کردووەو نە ئەو موحەسسیناتە لەفظی یانەشی دەرخستووە ، ئەبێ چیی کردبێ ؟ بە لای دوکتۆرەوە شتی بایەخدار ساغ کردنەوەی تێکستی شیعری نالی یە ، بەڵام لە ڕێگای دەرخستنی جیاوازی یەکانی نوسخە دەسنووس‌و چاپەکانەوە نا ، چونکە لای وایە ئەو جیاوازی یانە هەڵەی بنووسی نەخوێندەوارو کۆلکە خوێندەوارن .. کەواتە ئەی لە چ ڕێگایەکەوە ؟ دوکتۆر وەڵامی ئەم پرسیارە گەورەیە ناداتەوە و نالێ ڕاستەکە چۆن ئەدۆزرێتەوە ، بەڵام تەماشاکردنی کارەکەی پەنجەمان ئەخاتە سەری‌و ئەڵێ لە ڕێگای بۆچوونی بێ بەڵگەو دەلیلی تایبەتیی دوکتۆر خۆیەوە کە تێکڕا لە سنووری توانای بەئاسانی خوێندنەوەی چاپەکەی ( عەلی موقبیل )و (گیو) دەرناچێ. ئێمە کە هاتووین تەماشای هەموو تێکستەکانمان کردووەو هەوڵمان‌داوە لە لێکدانی هەموویان گونجاوترین‌و جوانترین‌و هونەری‌ترین تێکست دیاری‌بکەین‌و بیخەینە بەردەستی خوێندەوارو ، جیاوازی‌یەکانیشمان لە داوێنەوە نووسیوەتەوە ، نەك تەنها لەگەڵ نالی‌و لەگەڵ ئەوانەی نوسخەکانیان نووسیوەتەوە و لەگەڵ خوێندەواریش ئەمین بووین‌و قەدری ماف‌و ڕەنجی هەموانمان زانیوەو پشت‌گوێمان نەخستووە ، ئەوەشمان ڕەچاو کردووە کە « وفوقَ کلٍّ ذی علمٍ علیم »و زۆر لەوانەیە کەسێکی‌تر هەبێ بۆچوونێکی‌تری بێ‌و بتوانێ بەهۆی چاوگێڕانەوەوە بەو جیاوازی‌یانەدا ڕاستی‌یەکی‌تری باشتر بدۆزێتەوە یا هەڵەیەك لە بۆچوونەکەی ئێمەدا دیاری بکا .. ئێمە بەو کارەی کە کردوومانە وەك تێکستی هەموو نوسخە دەسنووس‌و لەچاپدراوەکانمان چاپ‌کردبێ ، وایە . باشە بۆ ئەبێ ئەمە هەموو بە جیرەی قەڵەمێك بخرێتە

پشت‌گوێ‌و بە ساغ‌کردنەوەی تێکست دانەنرێ ، کەچی کارەکەی دوکتۆر کە بە چەند قۆناغ لەپاش کارەکەی ئێمەوەیە ، ساغ‌کردنەوەی تێکست بێ‌و لە هینەکەی ئێمەش زیاتر بێ ؟ ئیتر چش لەوەش کە نوسخەکانی لای ئێمە لە زوربەی نوسخەکانی بەردەستی دوکتۆر ڕاست‌ترو جێی متمانەترو بڕوا پێکراوترن‌و نوسخەی‌وایان تیایە مەلای پایە بڵندو نالی‌زانی شارەزا نووسیونیانەتەوەو خۆیانیان پێیانەوە ماندوو کردووە ..

ئەنجا بایەخ‌دان بە فەرهەنگی نالی ئەبێ چۆن بێ ؟ ئەبێ بە مەعنا لێدانەوەی ڕاستی زاراوەو وشەو دەربڕینی یاری بە وشە کردنەکانی نالی بێ ، یا هەر بەوە کە وشەکان لە داوێنی کتێبەکەوە ڕیز بکرێن ، ئیتر چش لەوە کە چۆن مەعنایان لێئەدرێتەوە ، وەك دوکتۆر کردوویەتی ؟ دوکتۆر مارف بەم ڕێبازەی کە گرتوویەتەبەر کە تەنها وشەو زاراوەکانی «لێکداوەتەوە»، خۆی لە بەرەوڕووبوونەوەی خوێندەواران دەرباز کردووە کە لێی بپرسن فلانە بەیت مەعنای چۆنە کە دیارە ئەوەش پرسیارێکی دژوارە هەمووکەس لەعۆدەی وەڵامدانەوەی نایەت .. بەوەش کە هاتووە «لێکدانەوە»ی وشەو زاراوەکانیشی خستووەتە دوایی کتێبەکەیەوەو ئەشزانێ کەسێ کە پارچە شیعرێك ئەخوێنێتەوە ، ئەبێ تا لێئەبێتەوە سی ـ چل جار تەماشای فەرهەنگەکەی بۆ بکاو پەڕە هەڵبداتەوەو بەدوای وشەدا بگەڕێ کە ئەوەش کارێکی گرانەو ناکرێ‌و تامی شیعر خوێندنەوەکەی ناهێڵێ ، خۆی لەوەش دەرباز کردووە کە خوێندەوار بزانێ لە فەرهەنگەکەدا چی نووسراوەو وشەو زاراوەکان چۆن لێك‌دراونەتەوە . بە لێك جوێ‌کردنەوەی تیپی بێ‌دەنگ‌و تیپی بزوێنیش لە وشەکانی فەرهەنگەکەدا ، ئەرکی تەماشاکردنی فەرهەنگەکەی ئەوەندەی‌تر ئاڵۆز کردووە ، سەرەڕای گوێ‌نەدانیش بە شوێنی ڕاستەقینەی وشە لە چوارچێوەی دەس‌پێ‌کرانی بە تیپی بێ‌دەنگ یا تیپی بزوێندا .. جا کە خوێندەوار خۆی لە بەردەمی

شیعرێکی ڕەق‌وتەقی بێ‌لێکدانەوەو ، فەرهەنگ دوورو لـە دەس‌ڕەسـدا نەبووی ، بێ‌فاریزەو نوختەو شاریحەو ئەداتی تەعەجوب‌و ئیسـتیفهام‌دا ئەیینێ ، هەر ئەوەی بـۆ ئەمێنێ کتێبەکەی بخاتە ئەولاوەو . نە شـیعری خوێندبێتەوەو نە نالیی ناسیبێ[٣]و ، ڕەنگە ئەو مەبەستەش کە دوکتۆر لە بڵاوکردنەوەی دیوانی نالی‌دا ڕەچاوی گرتووەو پێشتر خۆی وتی جیایە لە مەبەستی ئێمە لەم‌کارەدا ، هەر ئەمە بێ‌و دیارە ئەگەر واش‌بێ تا ڕادەیەکی باش بۆی هاتووەتەدی !

کەسـێ کە ساڵەهای سـاڵ بێ خەریکی تۆژینەوەو لێوردبوونەوەو لێکدانەوەی نالی بێ‌و ، بەو پایە بەرزەی زانسـتیشەوە کە دیارە دەسـتی هەمووکەس ناکەوێ هەمیشە هەر هاوارو دادی بێ لەدەست گرانی‌و قووڵی‌و بەدەرەتانیی جیهانی نالی ، کەچی کە ( کاری عومر )ی لەگەڵ شیعری نالی بخاتە بەردەستی خوێندەوارانی وەچەی ئـەمڕۆی کورد ، کە وەك خۆی ئـەڵێ « نالی‌و شاعیرانی کلاسـیکیی‌تر ناچنـە ناودڵیانەوە »و لەبەرئەوە بەرنامەیان بۆ دانێ بۆ تێگەیشتنی نالی ــ لەجیاتیی ئەوەی شیعرەکانیان بۆ یەکالا کاتەوەو مەعنایـان بۆ ڕوون کاتەوە ، بێت تەنهـا مەعنـای وشـەو زاراوەکانیان بۆ لێکداتەوە ( ئـەویش بەپێی فەرهەنگی زمانی فارسـی‌و بەوجۆرە وردو جوان‌و بێ‌گەردە ، خوا نەیبڕێ ! ) و لەوئاستەدا بوەستێ‌و بڵێ « ئیتر پێویستە خوێندەوار شارەزایی‌و زانایی خۆی بەکاربێنێ بـۆ تێگەیشتنی شیعرەکە »و ئەمەش بە « پلەیەکی گرنگ »ی‌وا دانێ کە «کەمتر تەنگ‌و چەڵەمە دروست‌دەکا » ، ئەوە ئەبێ لە خوا بپاڕێینەوە بـۆی کە لـە بەشی دووهەمی لێکۆڵینەوەکەیدا لەسەر نالی کە ئەڵێ « فراوان‌و دوورو

---

(٣) بەهۆی بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی ئەو مەعنا سەیرانەوە نەبوایە کە دوکتۆر خستوونیەتە ناو فەرهەنگەکەیەوە ، خەڵکێکی کەم نـەبێ تەماشای ئەو فەرهەنگەیان نەئەکرد .

درێژە »و باسی « ڕوخسارو ناوەڕۆکی شیعری نالی » ئەکاو « ڕەنگە فراوانترین کتێبی کوردی بێ کە لەسەر شاعیرێك نووسراییتەوە » ، دەست بەباڵیەوە بگرێ‌و یارمەتیی بداو لەم کەندو کۆسپانەی بەدوور دانێ کە لەم بەشی یەکەمەیدا هاتوونەتە ڕێی ••

دوکتۆر لە دواخاڵی ئەم پاشەکیەیدا کە خاڵی سێهەمیەتی ، ئەڵێ : « بەراوردێك لەنێوان سەرچاوەی ئێمەو ئەوان ئەوە دەرئەخا کە سەرچاوەکانی ئێمە زۆرترو دەولەمەندترن ، بە بەلگەی ئەوەی هەموو شیعرە ڕاستەقینەکانی نالی ئەوەی لە چاپی ئەواندا هەیە ، لە چاپی ئێمەش هەن ، سەرەڕای ئەوانیش گەلێ دێڕە شیعریوا لە چاپەکەی ئێمەدا هەیە لای‌ئەوان نیە » •

ئەگەرگوێ بەوە نەدەین کە دوکتۆر لە پەراوێزی ژمارە (٤٥)ی سەرەتاکەیدا ، بێ‌پیشاندانی هیچ جۆرە بەلگەیەك نووسیویە « لەڕاستیدا زیاتر لە ٢٠ نوسخە دیوانی دەسنووسی نالی بەکارهێنراوە » لە ئامادەکردنی کتێبەکەی ئەودا ، ئەوا دیارە تێکڕای ئەو سەرچاوانەی ئەو ڕیزی‌کردوون هەژدە سەرچاوەن کە سیانیان هیچ جۆرە ناوونیشانێکیان نیە ، لەم سیانە یەکێکیان بیستنە لە زاری ئەم‌و ئەو ، دوانیشیان « کۆمەلە دەفتەرو بەیازو پەڕە کاغەزە کۆن»ن کە لەم‌لاو لەولا بەرچاوی کەوتوون ، یا لە ئەرشیفی نامەخانەی تایبەتیی خۆیاندان • دیارە سەرچاوەی‌وایش ، مادەم بە ڕوونی‌و درێژی باسی نەکرێ ، لە جیهانی زانستدا پشتێکی ئەوتۆی پێ نابەسترێ • ئەو پازدەکەشی چواریان نوسخە چاپەکانن کە لای ئیمەش بوون • تەنها شەشیان دەسنووسی تایبەتیی دیوانی نالین ، پێنجیشیان یا هەڕەمە یا پارچە دەسنووسن • سەرچاوەکانی ئێمەش نۆزدە سەرچاوەن ، سێ دیوانی

چاپ[٤]و دوازده دیوانی تایبەتیی شیعری نالیو ، یەك کەشکۆڵو سێ پارچە شیعری تەنها • ئــەوەش بزانین کە ئێمە بەدرێژیو تێرو تەســەل لەســەر دەسنووســەکانی لای خــۆمانمان نووســـیوەو بەشـــی هەرەزۆری دەسنووسەکانمان هییوان بەتەواوی پشـــتیان پێ ببەســـترێ • بۆنموونە کوردستانی ئەم سی چل ساڵەی دوایی نالیزانی وەك مــەلا موحەممەدی چروستانیو مەلا عارفی چنگنیانی تیا نەبوە ، کە دوان لــە دەسنووسەکانی لای ئێمە خەتی ئەو دوو زانایەن •• ئیتر نازانم دوکتۆر مارف چۆن زاتئەکا بڵێ سەرچاوەکانی ئەو زۆرترو دەوڵەمەندترن • من لە بنەڕەتدا دوودڵم لەوە کەسەرچاوەی لەوانە باشتری بووبێ کە وێنەی بە زەنکۆگراف گرتوون ، ئەگینا بۆچی وێنەی ئەوانەشی نەگرت ؟• ئەوەش کە ئەڵێ هەرچی لای ئێمە هەیە لای ئەویش هەیە ، نابێ بە بەڵگەی هیچ ، چونکە چاپەکەی ئێمە بەر لە هینەکەی ئەو دەرچووەو ئێمە پتر لە جارێ ئیسپاتمان کرد کە ئەو لە گەڵێ شتدا پشتی بە چاپەکەی ئێمە بەستووەو پارچە شـیعری لێ وەرگرتووەو شیعری لەبەر ڕاستکردووەتەوە • ئەگەر نوسخەکەی دوکتۆر مارف دوو سێ بەیتی تیابێ لای ئێمە نەبێ ، ئەوە بە سەنگو ترازووی زانســت ئەبێ گلەیی لەو بکرێ کە ئەیزانی چاپەکەی ئێمە پێشتر دەرئەچێ ، کەچی نەیکرد ئەو چەند بەیتەمان بخاتە بەردەست تا نوسخەکەی ئێمەیش تەواو بێ •



(٤) ئێمە هەردوو چاپەکەی گیـو موکریانیمان هەر بــە یەك چاپ دانــاوە ، چونکە لەبارەی تێکستەوە جیاوازییان نییە .

## ئەو ئەنجامانەی لە وردبوونەوە لە تێکستی شیعرەکانی «دیوانی نالی»یەکەی دوکتۆر مارفەوە دەستگیرم بوون

ئەمەش بەشی دووهەمی ئەو ڕەخنەیە کە لە ( دیوانی نالیو فەرهەنگی نالی )یەکەی دوکتۆر مارف خەزنەداری ئەگرم • لەم بەشەدا بەراوردێکی ئەو تێکستەم کردووە کە دوکتۆر مارف ، بە قسەی خۆی ، لەناو ٢٢ نوسخەی دەسنووسو چاپدا هەلیبژاردووەو، وەك ئەلێ ، لەناو هەمووشیاندا ئەو تێکستەی دەستنیشان کردووە کە لە ( گیانی نالی )یەوە نزیکترە •• بەراوردم کردووە لەگەڵ تێکستی هەلبژاردەی چاپەکەی خۆمان و ئەو تێکستانەی کە لە پەراوێزدا نووسیومانەتەوە • من لەئەنجامی ئەم بەراوردەدا بەشێکی ئەو هەڵانە دەرئەبڕم کە دوکتۆر تێیانکەوتووە چ لەبارەی زانینی تێکستی وشەیەك یا ڕستەیەك یا لەبارەی ڕێنووس یا لەبارەی تێکچوونی سەنگی بەیت یا لەبارەی هەلبژاردنی تێکستی نزیکترەوە لە (گیانی نالی) ، ئەو شتەی کە دوکتۆر حەزئەکا هەمیشە لێیبدوێ •

وتم « بەشێکی هەڵەکان » ، چونکە ڕاستەکەی ئەگەر هەموو هەڵەکانم دەستنیشان بکردایە ، ئەم کتێبە گەلێ گەورەتری لێ دەرئەچوو• ئەوەش نە لەگەڵ مەبەستی زوو دەرکردنی کتێبەکە ئەگونجێ و نە لەگەڵ سوودی خوێندەواران • بەڵام هەرچۆن بێ من تێکڕای هەڵە گرنگترەکانم دەستنیشان کردووەو دڵنیام لەوەش کە خوێندەواران خۆیان ئەتوانن لەبەر

ڕووناکیی ئەم هەڵە دیاریکراوانەدا هەڵەکانیتریش دیاریبکەن • ئەوەش بڵێم کە لە هەموو ئەو وشانەش نەدواوم کە بـە هەڵەم زانیون بەڵام لـە نوسخەی باوەڕپێکراوی خۆیشماندا وایش نووسراوە •

من تێکستیٚ بەیتەکانیشـم بەوجۆرە نووسـیوەتەوە کە دوکتۆر نووسیویەتیەوە• مەبەستم لەمەش ئاگادارکردنی خوێندەوارانە لەو پشتگوێ خستنەی ڕێبازی نووسینو بڕگە بڕگە کردنی ڕستە کە دوکتۆر لە تەواوی دیوانەکەدا کردوویە بە پیشەی خۆی • تەنها لە شـتێکدا وەك دوکتۆرم نەکردووە ، ئەویش ئەوەتە نیشانەی (ر)ی قەڵەوم لە بنەوە دانەناوە وەك دوکتۆر ، بەڵکو بەپێی ڕێنووسی کۆڕی زانیاری کورد لە سەرەوەم داناوە، چونکە لە چاپخانەی کۆڕدا (ر)ی نیشانە لەژێر لە بەردەستدا نەبوو •

من بەهۆی ئەم بەراوردەوە گەیشتوومەتە چەند ئەنجامێك ، وا لێرەدا بەکورتی پەنجەیان بۆ ڕائەکێشم •

١ــ دوکتۆر نوسخەکەی تەنها لەبەر نوسـخەی چاپی عەلی موقبیل نووسیوەتەوە کە خوالیخۆشبوو گیو موکریانیش نوسخەکەی خـۆی لەبەری نووسیوەتەوە • تەنها ئەو غەزەلو قەصیدەو تاقە بەیتانە نەبێ کە لـە چاپی عەلی موقبیلدا نـین ، بۆئەوانـە ناچار بووە لـەبەر نوسـخەیتر بیانووسێتەوە • دوکتۆر مەگەر بەدەگمەن گەڕابێتەوە سـەر نوسخەی دەسنووس ، هەرچەند ئەشڵێ تێکستی دیوانەکەی هەڵبژاردەی ٢٢ نوسخە چاپو دەسنووسە • گەلێ لە پەراوێزەکانیشی لەبەر نوسخەکەی ئێمە داناوە، واتە لە زۆر لەو شوێنانەدا کە پەراوێزی تیا داناون ، لەو تێکستانەی کردووە بە پەراوێز کە ئێمە لە چاپەکەی خۆماندا کردوومانن بـە بڕبڕەو تێکستی هەڵبژاردە • لە هەندێ شوێنی هەڵە زەقیشدا تێکستی هەڵبژاردەکەی خۆی لە ڕووی تێکستی هەڵبژاردەی ئێمە ڕاست کردووەتەوە • زۆریتریش لەو

تێکستانەی خستوونیەتە پەراوێزەوە لەوانەن کە جیاوازی‌یەکی بایەخداریان نەگەن تێکستە هەڵبژاردەکەی نی‌یە • کەچی وەك من لە بەراوردکردنەکەمەوە دەیانجار بۆم دەرکەوتووە ، گەلێ تێکستی بایەخداری ناو نوسخە پەراوێز خراوەکانمان هەیە ــ کە دیارە ئەبێ هەر هیچ نەبێ هەندێکیان لە نوسخەکانی بەردەستی دوکتۆریشدابووبن ــ ، دوکتۆر مارف هەر بەجارێ پشت‌گوێی خستوون •

٢ ــ ئەو وشانەی کە لە فارسی‌و کوردیدا چون‌یەکن ، زوربەیانی گێڕاوەتەوە بۆ سەر فارسی • هەروەها ئەو وشانەش کە لە عەرەبی‌یەوە هاتوونەتە ناو کوردی ، زۆریانی کردووەتەوە بە عەرەبی •

٣ ــ لە زۆر شوێندا دانانی نیشانەی دەنگە کوردی‌یەکانی پشت‌گوێ خستووە •

٤ ــ گوێی بەوە نەداوە کە ڕستەکان بە شێوەیەکی ڕاست بڕگە بڕگە بکا • ئەمەش نیشانەیەکی ئاشکرای نەزانینی مەعنای بەیتەکانە • بۆنموونە وشەی (دا) کە جاروبار فیعلەو جاروبار نیشانەی زەرفی‌یەتە ، دوکتۆر وەکو یەك تەماشایان ئەکاو هەردوکیان بە وشەی پێشیانەوە ئەنووسێنێ • دیارە ئەگەر دوکتۆر لە یەکی بکردنایەتەوە ، هەردوکیانی بە یەك چاو تەماشا نەئەکرد •

٥ ــ دوکتۆر ، مەگەر بەدەگمەن ، ئەگینا هیچ‌کام لەو نیشانە نوێ‌یانەی دانەناوە کە ڕستەیان پێ ڕۆشن‌ئەکرێتەوە وەك نوختە (•)و دوو نوختە ( : )و فاریزە ( ، )و نیشانەی پرسیار ( ؟ )و نیشانەی سەرسامی ( ! )• ئەمەیش لەڕاستیدا نیشانەیەکی ئاشکرای نەزانینی مەعنای شیعرەکانە • بنووس کە ئەو نیشانانەی دانا ، هەم بە خەڵکی ڕائەگەیەنێ کە مەعنای بەیتەکە ئەزانێ‌و هەم یارمەتی‌یشیان ئەدا کە ئەوانیش باش تێی‌بگەن • بەپێچەوانەوە دانەنانی

ئەو نیشانانە هۆیەکی ئاسانە بۆ خۆ دەربازکردن لە هەموو بەرپرسییەك لەمڕووەوەو بە جۆرێکیوایش کە کەس یەکەندەردوو هەستبەوەنەکا کە بنووس مەعنای بەیتەکە نازانێ •

٦ ــ لەبەر نەبوونی نیشانەی عەطف یا ئیضافە لەسەر وشە لە دەسنووسە کۆنەکاندا ، عەلی موقبیل لە گەلێ شوێندا کەوتووەتە هەڵەوەو نەیزانیوە شوێنەکە شوێنی عەطفە یا شوێنی ئیضافەیە • دوکتۆریش ، بە چاولێکەریی عەلی موقبیل ، هەمان هەڵەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە دیوانەکەوە •

٧ ــ کەمیی پەراوێزەکانی دوکتۆر نیشانەیەکی ئاشکرای ئەوەن کە بە هیچ کلۆجێ گوێی بەوە نەداوە کە چەند نوسخەی دەسنووسی لە بەردەستدا بووەو کەلکی لێ وەرنەگرتوون • تەماشایەکی چاپەکەی ئێمە پیشانیئەدا کەوا لە هەر بەیتێکدا بیگری لەوانەیە ئەوەندەی جیاوازیی نوسخەکان جیاوازی هەبێ ، کەچی دوکتۆر بەدەگمەن نەبێ پەراوێزی دانەناوەو لەناو ئەوانەشدا بەدەگمەن نەبێ دوو جیاوازیی نەنووسیوەتەوە • ئەم پەراوێزانەش زۆریان تێکستی ڕاستتری ناو نوسخە جیاجیاکانن • ئەمەش نیشانەیەکی ئاشکرای ئەوەیە کە بەشێکی زۆریانی نەك لە دەستنووسەکانی بەردەستی ، بەڵکو لە نوسخەکەی ئێمە وەرگرتووە ، وەك پێشتریش وتم •

٨ ــ وەك وتمو وەك دوکتۆر خۆیشی لە سەرەتای کتێبەکەیدا دانی پیا ناوە، کارەکەی لەسەر بناغەی چاپەکەی عەلی موقبیل دەستپێکردووە • ئەمە لەلایەکەوەو ، گوێنەدانیشی بە نوسخەکانیتری بەردەستیو کەلكوەرنەگرتنی لێیان لە لایەکیترەوە ، بوون بەهۆی ئەوە وەك چۆن نەیتوانیوە تێکستی ڕاست هەڵبژێرێ ، لەناو تێکستە ڕاستەکانیشدا نەیتوانیوە جوانترینو پڕمەعناترینیان هەڵبژێرێ • من گەلێ لەمانەم لە

بەراوردەکانمدا دەست‌نیشان کردووە •

٩ ـ دوکتۆر لە نووسینەوەی دیوانەکەی نالیدا پیشانی‌داوین کە هیچ شارەزای هونەری عەرووز نی‌یە • زۆر شوێنی‌وا لە شیعرەکاندا هەیە یەك پیت ئەبێ بە دوان بخوێنرێتەوەو بەپێچەوانەشەوە ، تا سەنگی بەیتەکە ڕاست‌ببێتەوە • دوکتۆر ئەمانەی بەتەواوی پشت‌گوێ خستووە •

ئەمە گرنگترینی ئەو سەرنجانە بوو کە لە خوێندنەوەو بەراوردکردنی تێکستی نالی‌یەکەی دوکتۆرو مارفەوە لەگەڵ نوسخەکەی خۆمان‌و ئەو دەسنووسانەی پشتمان پێ‌بەستوون ، بۆم دەرکەوتن • ئێستاش ئەگەر تاقەتتان لێ‌یە فەرموونە سەر یەکەیەکەی هەڵە گرنگەکانی تێکستە هەڵبژاردەکەی دوکتۆر •



# تێکستی شیعرەکان

## تیپی (أ)

### غەزەلی ( ١ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٢٨ ــ ١٣٢ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٤٣ )

**ڕیشەکەی پان و درێژە بووریا خزمەت دەکا**
**زاهیرە هەر کەس لە توول و عەرزی ڕیشی‌دا ڕیا**

بووریا : لە پلەی یەکەمدا نالی ( بۆ ڕیا )ی مەبەست بووە تا لەگەڵ (ڕیا)ی نیوە بەیتی دووهەمیشدا بگونجێ . زانیویشیە کە شێوەی نووسین(ی ئەوسا ) مەیدانی ئەوەش ئەدا کەوا بە ( بووریا )یش بخوێنرێتەوە . لـە : ڕاستەکەی (بە)یە . کورد ئەڵێن : فلاًنکەس ڕیاوە بە فلاًنە شتدا . نالێن : لە فلاًنە شتدا . تەنانەت ئەگەر مەبەستی نالی لـە (ڕیا) فیعلی (ڕیتن)یش نەبێ و هەر (ڕیا)ی بە مەعنای (ڕووپامـالی)بێ هــەر (بە) کوردانــەترە . (توول)یش هەڵەیە ، ڕاستەکەی (توول)ە لە (طول)ی بەرانبەری ( عرض )ی عەرەبی‌یەوە .

### غەزەلی ( ٢ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٨٣ ــ ٨٦ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٤٤ )

**تاتایی سەری توورەیی پڕ پێچشی بادا**
**هەر تایێکی بارێکی گوڵ و نافە بە بادا**

تاتایی : ڕاستەکەی ( تا تایی )یە ، واتە : هەتا تاڵێکی ، نەك تاڵ تالی.

تووره‌یی : ڕاسته‌که‌ی ( توڕژه‌یی = طوڕژه‌یی )یه • تایێکی : ڕاسته‌که‌ی
(تایه‌کی)یه ، ئه‌گینا سه‌نگی به‌یته‌که له‌نگ ئه‌بێ • بادا : ئه‌بێ بـه ( با دا )
بنووسرێ چونکه (دا)که‌ی فیعله وه‌ك ئه‌ڵێن فلاّنه‌که‌س فلاّنه شتی دا به با •

**گوڵ هاته ده‌رێ لافی له حوسنی بوتمان‌دا**
**له‌رزی قه‌دی به‌رزی له ڕقا زوڵفی که بادا**

بوتمان : ڕاسته‌که‌ی ( بوتی ما )یه ، هه‌م له‌به‌ر هاوسه‌نگیی (ما) له‌گه‌ڵ
وشه‌کانی دوا نیوه به‌یته‌کانی‌ترو ، هه‌م له‌به‌ر باری مۆسیقای نیوه به‌یته‌که
خۆیشی •

**شه‌و چه‌پکه‌ن و نیلۆفه‌ری‌یو جیلوه‌یی ڕه‌قسی**
**شه‌رمه‌نده ده‌کا زوهره‌یی زه‌هرا له سه‌مادا**

چه‌پکه‌ن‌و : ڕاسـته‌که‌ی ( چـه‌پکه‌نی )یه واتـه جلی شـه‌وخه‌فو ؛
(نیلۆفه‌ری)یه‌که صیفه‌تیه‌تی • شه‌رمه‌نده : له‌کوردیدا (شه‌رمنده)یه •

**خۆش سوبحده‌مێکه که به خه‌نده‌ی ده‌نوێنێ**
**به‌س زه‌رره‌یی خورشید له زه‌رره‌یکی سوهادا**

زه‌رره‌یکی [ ذه‌ڕڕه‌یکی ] : ڕاسته‌که‌ی ( زه‌ڕڕێکی ـ ذه‌ڕڕێکی )یه•
(ذه‌ڕڕه‌یکی) زاراوه‌ی سنه‌و ده‌وروبه‌ریه‌تی • له ده‌سنووسه کۆنه‌کانیشدا
نووسراوه ( ذریکی ) • دوکتۆر ئه‌بێ به به‌ڵگه ئیسپاتی بکا که مه‌به‌ستی
نالی ( ذه‌ڕڕه‌یکی ) بووه نه‌ك ( ذه‌ڕڕێکی ) که زاراوه‌ی سلێمانی‌یه •

**ده‌مده‌م که ده‌کا زاری پڕ ئازاری به غونچه**
**بۆ ده‌عوه‌تی ماچی له‌بی گۆیا ده‌می نادا**

ده‌مده‌م : ئه‌بێ به ( ده‌م ده‌م ) بنووسرێ • له‌بی : ڕاسته‌که‌ی (له‌به)یه‌و
نـاسکیی شیعره‌که‌ش له‌وه‌دایـه‌و ، ئـه‌مجۆره ورده‌کاری‌یه مه‌عنایی‌یانه‌ن
پێیان‌ئه‌ڵێن ( جیهانی نالی ) •••

**سهم‌ُ الف‌ِ القد‌ّ فقد صاد‌َ فوآدی**
**صاد هو من‌َ عینه قد صادف صادا**

سەهْمُ الِفِ القدِ : لە عەرەبیدا شتیوا نیەو هیچ مەعنایەك نابەخشێ • ڕاستەکەی ( سهْمُ اَلِفُ القدِ )یە •

**بۆ ماچی دەمی ڕەنگە لە عیشوەی خەمی ئەبرۆ**
**جۆیایی بەقا خۆی لە دەمی تێغی فەنادا**

ئەبرۆ : ڕاستەکەی ( ئەبرۆی )یە ، چونکە باس باسی برۆی یارە نەك تێکڕای برۆ • فەنادا : ئەبێ بە ( فەنا دا ) بنووسرێ چونکە ( دا )کەی فیعلە لە (دان)ی بە مەعنا ( خۆپیادان ) •

**غەزەلی ( ٣ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٧٩ ــ ٨٢ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٤٥ )

**خاکی بەری پێت هەم گڵە هەم گوڵ بە سریشکم**
**وەختی غەم و شادی ئەوە کردوومە بە سەردا**

گڵە : ڕاستەکەی (گڵ)و)ە • بە شێوە نووسینی کۆن (گڵ)و (گوڵ) وەك یەك بە (گِل) ئەنووسران • (و)ی عەطفو (ی)ی ئیضافەش ئەوسا نەئەنووسران ، بەڵام (ە)ی ضەمیر ئەنووسرا • نالیش جیناسەکەی تێوان (گڵ = گل)و (گوڵ = گل)ی مەبەست بووە • سریشکم : (سریشك) وشەکەیە لە فارسیدا • لە کوردیدا (سروشك)ە • وەختی : ڕاستەکەی (وەقتی)یە • نالی ئەم جۆرە وشانە بەگوێرەی ئەسڵەکەیان بەکاردێنێو لە نوسخە دەسنووسەکانیشدا هەر وا نووسراوە •

**شەوقی کە نەبێ باسیرە مەئیووسە لە دیتن**
**هەر شەوقی ئەوە قووەتی دێنێ بە نەزەردا**

باسیرە : ئەو چوکلەی (ر)یە بۆ ؟ ڕاستەکەی ( باسیرە = باصیرە)یە • دێنێ : ڕاستەکەی (دینی)یە واتە : دیتنی ، ئەگینا مەعلووم نابێ قووەتی چی مەبەستە • نەزەردا : ڕاستەکەی (نەزەر دا)یە • (نەزەر) بە مەعنا چاوو (دا)یش فیعلە بەمەعنا (بەخشی) •

**تەلبیسی نی‌یە گەر کەسێ دێوانەیی ڕووتە**
**بێ چارە نەما غەیری حەیاتێکی لە بەردا**

گەر کەسێ : ڕاستەکەی (ئەوکەسە)یە ، چونکە ( گەر کەسێ ) دوودڵی ئەگەیەنێ لە بوونی کەسەکەداو ، بێ‌گومانیی بوونی ئەو جۆرەکەسانە لەکەدار ئەکا ، کە ئەوەش بۆ یارێکی نازدار ناگونجێ •

**هەر چەندە کە ئینسانە لەبەر چاوی من و تۆ**
**مومکین نی‌یە ئەم نوقتە لە ئینسان و بەشەردا**

نوقتە : ڕاستەکەی ( لوطفە )یە ، چونکە مەبەست گەیاندنی مەعنای (جیسمی لەطیف)ە •

**ئالوودە نەبێ دا بە زەبوون گیری‌یە خوێنم**
**بۆ کوشتنی من دامەنی پاکی لە کەمەردا**

زەبوون‌گیری‌یە : ڕاستەکەی ( زەبوون‌گیری‌یی )یە • بەوجۆرەی دوکتۆر مارف نووسیویە هیچ مەعنایەك نابەخشێ • کەمەردا : ڕاستەکەی (کەمەر دا)یە •

**ڕەنگی نی‌یە ڕوخسارەیی ڕەنگین و لەطیفی**
**ڕەوشەن بووە ئەم نوکتە سەباتی لە بەسەڕدا**

بەسەڕ : ڕاستەکەی ( بەسەر = بەصەر )ە •

**غەزەلی ( ٤ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٨٩ ــ ٩٢ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٤٦ )

**جۆششی تاوە لە نێو دیدەیی گریانمدا**
**چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی تۆفانمدا**

جۆششی : ڕاستەکەی ( جۆشش‌و )وە •

**شەبەهی زولفی شەبەهـ گۆنەیی ڕووگەردانی**
**ئەسەری سۆزشی گریانە لە ئەفغانمدا**

شەبەھ گۆنەیی : ڕاستەکەی ( شەبەھ‌گۆنەیە )یە • سامانم‌دا : ڕاستەکەی (سامانم دا)یە •

**شەرەری تابش و بارش لە دەمی ڕەعدی بەھار**
**ئەثەری سۆزشی گریانە لە ئەفغانم‌دا**

شەرەری : ڕاستەکەی ( شەرەرو )وە •

**تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی**
**لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سۆزانم‌دا**

حۆری : ڕاستەکەی ( حۆریت )ە • ئەگەر بشڵێین (ت)ی ضەمیری موخاطەبەکە بە جۆرە (ی)یەکی منگن وتراوە ، ئەوە ئەبوو بینووسی‌رایە ( حۆریی ) •

**شیرەیی جانە گوتم ، یا مەیە ، چا بوو فەرمووی**
**عەکسی لەعلی لەبی مەرجانە لە فینجانم‌دا**

فینجان : ڕاستەکەی (فنجان)ە • ئەم (ژێرە)یە بۆ بەسەر (فێ)کەوە بێ ؟ کێ لە کوردیدا وای‌ئەخوێنێتەوە ؟

**غەزەلی ( ٥ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٩٣ ــ ٩٥ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٤٧ )

**گەر بێیە دەرێ سەرووی ڕەوانی لە ئیرەم‌دا**
**وەر نایێ دەرێ ئاھوویی چینی لە حەرەم‌دا**

نایێ دەرێ : ڕاستەکەی (نەییە دەرێ)یە ، لە ڕووی مەعناوە لەبەر بەراورد بە (بێیە دەرێ) • لە ڕووی فۆرمیشەوە چونکە (نایێ) نیوە بەیتەکە لەنگ ئەکا • زیاد لەمە ئەگەر ( نایێ ) بوایە ئەبوو بە ( نایە ) بنووسرایە کە سووک‌کراوەی (نایەیتە) بێ • ئاھوویی : ڕاستەکەی (ئاھووی)یە بە سێ بڕگەی ( ئا ، ھو ، وی ) ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ •

**بێ فائیدە بوو لافی دەمت غونچە لە دەمیا**
**با خوستی بڕی خستی کە مستێکی لە دەم‌دا**

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ، لە نوسخەکانی ئێمەدا ، لەگەڵ هەندێ وردە جیاوازی‌یشدا بەمجۆرەیە :

**لافی دەمی تۆ ، غونچە لە دەمیا بو ، بە ( عمدا )**

ئەم تێکستە ئەگەر لە تێکستەکەی لای دوکتۆریش باشتر نەبێ ، کە من لام‌وایە لەو باشترە ، خۆ هیچ نەبێ لە پلەی ئەودایە • تۆ بڵێی لە هیچ‌کام لە ١٨ و ٢٠ نوسخەکەی لای دوکتۆردا نەبووبێ ، یا دوکتۆر بە هەڵـەی نووسیاری دانابێ بۆیە پشت‌گوێی خستبێ ؟ دەمدا : ڕاستەکەی (دەم دا)یە•

**دڵ موزمەحیلی دەردە وەکوو دیدە لە نەمدا**
**حەیران و پەرێشانە وەکوو قەترە لە یەمدا**

نەم : ڕاستە (نەم) لەگەڵ (یەم) هاوسەنگەو ، ڕاستیشە بە فارسی هەر مەعنای (نم)ی کوردی ئەبەخشێ ، بەڵام ئاخۆ ڕاستە بۆ ئەم هاوسەنگی‌یە ناپێویستە ، وشەیەکی فارسی لەجیاتیی وشەیەکی کوردی بەکاربێنین ؟

**( نالی ) و مەسەلی حالی لە ئەشکەنجەیی غەمدا**
**وەك نالە لە نەیدا وەکو نالە لە قەلەمدا**

نالی‌و : ڕاستەکەی (نالی)یە بێ (و) ، چونکە مەبەسـت شوبهاندنی تەنها حالی نالی‌یە ، نەك نالی‌و حالی • زیاد لەوە ئەگەر بەیتەکە دوو تەشبیهی تیا بوایە ، لەبارەی ڕێزمانەوە نەئەبوو وا دارێژرێ •

## غەزەلی ( ٦ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٨٧ ــ ٨٩ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٤٧ ــ ٤٨)

**تەبەسسوم دەردەخا حوققەی دەمی جەوهەر لە نێو ئەودا**
**بەڵێ میسقالە زەررە زاهیرە جیلوەی لە پرتەودا**

دەمی : ڕاســتەکەی (دەمو)وە ، چونــکە ( حوققە )کە دەمی یـارو (جەوهەر)ەکە ددانەکانیەتی •

**به پوولێ نامەوێ دەرمان لە نەشئەی چاوی‌یە عیللەت**
**بە فلسێ ناکڕم عەنبەر لەگەڵ زولفی ئەوە سەودا**

پوولێ : ڕاستەکەی ( پارێك )ە • فلسێ : ڕاستەکەی ( پوولێك )ە ، چونکە یەکەم لە سەردەمی نالیدا (فلس) ڕەواج نەبوە • دووهەمیش لەبەرئەوە کە کورد ئەڵێن : پارەو پوول •

**ڕەقیبی جوفتەلی ، نابێتە نەخچیرت کە خەرگوڕە**
**ئەلیفی چایەرە دایم لە قەشقەی کەردز و جەودا**

کەردز : ڕاستەکەی ( کەردڕ )ە •

**سیلاحی پەرچەمی پڕ خەم ئەگەر تارە ئەگەر مارە**
**برۆ غەمزەی کەوان و تیرە گەر هەودا ئەگەر مەودا**

برۆ : ڕاستەکەی ( برۆ و )ە • تیرە گەر : ڕاستەکەی ( تیر ئەگەر )ە چونکە مەبەست شوبهاندنی (برۆ)و ( غەمزە )یە بە (کەوان)و (تیر)و ، ئەبێ هەموو ( ئەگەر )ەکانیش وەك یەك بن •

**وەها مەستی تەماشای چاوتە (نالی) کە نازانێ**
**بە بێداری دەبینێ یا لە نەشئەی مەستی و خەودا**

چاووتە : ڕاستەکەی (چاوتە)یە • مەستیو : ڕاستەکەی (مەستی‌یو)وە. ئەگینا لە هەردوو حاڵەکەدا بەیتەکە لەنگ ئەبێ •

**غەزەلی ( ٧ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٧٥ـ٧٨ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٤٨ )

**زەڕراتی عوکووسی کەششی میهری جەلالن**
**وا دێن و دەچن سەرزەدە سوڵتان و شەهنشا**

شەهنشا : ڕاستەکەی (شەهەنشا)یە • سەیرە ، دوکتۆر (نم)ی کوردیمان بۆ ئەکا بە ( نەم )ی فارسی ، کەچی (شەهەنشا) کە کوردیش‌و فارسیش هەر وای ئەڵێن ، ئەکا بە ( شەهنشا ) کە کەسیان وای ناڵێن !

**بەو ڕەحمەتی عامە کە دەکا سەنگی سیەهـ زەڕ**
**لەم قەلبە وەکو بەردەڕەشی ڕەششی ڕەشاشا**

عامە : ڕاستەکەی ( عامەت )ە چونکە قسە لەگەڵ خوا ئەکا •
بەردەڕەشی : ڕاستەکەی ( بەردە ، ڕەشە )یەو هەروایش مەعنا ئەبەخشێ •
ڕەششی ڕەشاشا : بە کوردی هیچ مەعنایەك نابەخشێ • ئەگەر بشڵێین عەرەبی‌یەو بە ئیملای کوردی نووسیویەتەوە ، ئەوە ئەبوو بینووسیایە (ڕوششە ڕەشاشا ) چونکە فیعلی ئەمرەو بە عەرەبی ( رُشَّ رَشاشاً )ە •

**(نالی) نیەتی سیحری بەیان ، حیکمەتی شیعرە**
**ئەمما هەیەتی قووەتی دڵ قودرەتی ئینشا**

(نیەتی) لێرەدا مەبەست لێی (نییەتی) واتە (نیازیەتی)یە ، بەڵام دوکتۆر بە نیشانەی ئەوەدا کە لە نیوە بەیتی دووهەمدا نووسیویە (هەیەتی) دیارە وای لێ حاڵی بووە لە مەعنای (نەبوون)ەوە هاتبێ ، کە ئەوەش هەڵەیە •
هەیەتی : ڕاستەکەی (نی‌یەتی)یە • هونەرەکەش، جگە لە ڕووی مەعناشەوە، لەو جیناسە و لەو کۆکردنەوەی دوو (نی‌یەتی)یەدایە •

**غەزەلی ( ٨ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١١٤ ــ ١١٨ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٤٩ )

**بادِرْ واغِرْ کَوکَبةَ البَدْرِ بِدارا**
**قَدْ فَقَتَ سَنا الشارِقِ لا ذُقتَ زَوالا**

اغِرْ : ڕاستەکەی ( أغِرْ )ە •

**شیقڤەی فەلەکولئەتلەسی ئەستوونەیی زەڕڕین**
**بێ بیکە بە تارای سەر و سرکەی خەز و واڵا**

شیقڤەی : ڕاستەکەی ( حوقڤەی )ە چونکە مەبەست ئاسمانە •
فەلەکولئەتلەسی : ڕاستەکەی : ( فەلەکولئەتلەس و )وە چونکە (ئەستوونەیی زێڕین )و ( فەلەکولئەتلەس ) جیان لە یەك • سرکەی : ڕاستەکەی (ترکەی)ە، ئەوەی کە دوکتۆر ئەیڵێ ، ( سرکە ) نی‌یە (سرکەیی)یە •

(نالی) بە ئومێدی زەفەری تۆق و تەلیسمت
ماری سڕی زولفت لە مل و گەردەنی ئاڵا

تۆق‌و : ڕاستەکەی ( تەوقی )یە •

غەزەلی ( ٩ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١١٨ ــ ١٢١ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٥٠ )

حیرەت زەدە وا دیدە وەکو حەلقەیی دەرما
بێ پایە نی‌یە عاشقی بێچارە بفەرما

پایە : ڕاستەکەی ( مایە )یە چونکە لێرەدا مەبەست شانازی‌کردنە بە بەهرەوە نەك بە پایەی کۆمەڵایەتی‌یەوە کە لای کەسێ وردبین بێ بایەخی نی‌یە ، هەرچەند لە چاپی (کوردی‌و مەریوانی)و چاپی (گیو موکریانی)یشدا (پایە)یە • دەرما : ڕاستەکەی ( دەر ما )یە• (دەر) بە مەعنا دەرگاو (ما)یش فیعلە لە مەصدەری (مان)ەوە •

یا توربەتی یا غوربەتی بارێ بشکێنن
هەر مونتەزیرە ( نالی ) ئەگەر مرد و ئەگەر ما

توربەتی : ڕاستەکەی ( توربەتێ )یە • غوربەتی : ڕاستەکەی (غوربەتێ)یە • بارێ : ڕاستەکەی (با ڕێ)یە • بشکێنن : ڕاستەکەی ( بشکێنین )ە •

غەزەلی ( ١٠ )

(لە چاپی ئێمەدا : ل ١٢٢ــ١٢٤ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥١ )

جەنانی وەك جینان کردم بە مەئوا
حەبیبەی مالیاوا مالی ئاوا

مەئوا : ڕاستەکەی (ماوا)یە لەبەر هاوسەنگیی نیوە بەیتەکان‌و لەبەر وشەئاراییش •

سەداق و ڕوونەما وو وەسلی شاهید
لەگەڵ شایی‌کەران بێ دەنگ و داوا

ڕوونەم : ڕاستەکەی ( ڕوونما )یە •

## غەزەلی ( ١١ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٢٤ــ١٢٨ • لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥١ــ٥٢ )

**مەخمەرە هاوی‌یەی هەولی فیراق**
**دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی قیا**

مەخمەرە : ڕاستەکەی ( مەمخەرە )یە • هەڵەکەش هەڵەی چاپ نی‌یە ، چونکە دوکتۆر لە فەرهەنگەکەشیدا وشـەی (مەخمەر)ی نووسـیوەو بە (مەخمەڵ)ی مەعنا لێداوەتەوە کە بە هیچ جۆرێ بۆ ئەم شوێنە ناگونجێ • وشەکەش لە هیچ لایەکی‌تری دیوانی نالیدا نی‌یە ••

**گەل ئەگەر تورکی ، تەعال ئەر عەرەبی**
**بێ ئەگەر کوردی ، ئەگەر فارسی بیا**

گەل : ڕاستەکەی (گێل)ە • کەسێ کە (گەل)و (گێل) لەیەك نەکاتەوە، چۆن ئەتوانێ بڕیار بـدا غەزەلێکی تورکی هیی نالی‌یە یا نـە ! فارسی : ڕاستەکەی (فورسی)یە لەبەر ڕاگیرکردنی سەنگی نیوە بەیتەکە •

**خاتری زاهید و خاڵی خاڵی**
**نی‌یە ئەلبەتتە لە بێنێکی ڕیا**

زاهیدو : ڕاستەکەی ( زاهیدی )یە • بـەپێی نووسینەکەی دوکتۆر ئەبێ ( خاڵی )ی یەکەم یا بە مەعنای (خاڵ) یا (خالۆ) بێ‌و هەرچۆنیش بـێ ئەبێ بۆنی ڕیای لێ بێ !! کەچی نالی ئەیەوێ بڵێ خـاتری زاهیـد هیـچ شتێکی بەکەڵکی تیا نی‌یە ، بەڵام ئەوەندە بۆگەنە بۆنی ( ڕیا )ی لێ دێ ، کە لەولاوە ( ڕیا ) مەعناکەی‌تریشی دیارە •

## غەزەلی ( ١٢ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٠٦ ــ ١٠٨ • لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٢ ــ ٥٣ )

**تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**
**ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لەم عەمدا وا دەکا**

لەم عەمدا : ڕاستەکەی ( لە عەمدەن = لە عمداً )ە • ئـەوا وتمـان (لەم)ەکە هەڵەی چاپە ، ئەی نازانم دوکتۆر چۆن ( عمـداً ) بە (عـەمدا) ئەنووسێ !

**بێنە حوجرە پارچە پارچەی موسوەددەم بکرێ بە ڕووح**
**هەر کەسێ کووتاڵ و پارچەی بێ بەدەل سەودا دەکا**

موسوەددەم : ڕاستەکەی (موسوەدەم)ە لەبەر ڕاگیرکردنی سەنگی نیوە بەیتەکە •

## غەزەلی ( ١٢ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٩٧ ــ ١٠١ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٣ )

**بەندەی ئەزەل بە خەتتی خۆی قابیلی قیسمەتێ بووە**
**ئێستە بە ئیقتیزای عەمەل جێگەیی خۆی تەڵەب دەکا**

بەندەی : ڕاستەکەی ( بەندە )یە • مەعناکەی ئاشکرایە •

**داری ئەراك و داری هیند هەردوو کە عوودە ئیسمیان**
**هەمدەمی سووتنە ئەم ئەو مەیلی ئەبی لەهەب دەکا**

سووتنە : ڕاستەکەی ( سوننەتە )یە ، چونکە باس لەوەیە کە داری ئەراك سیواکی لێ دروستئەکرێ و سیواککردنیش سوننەتە • سەرەڕای ئەوە کە ئەگەر ( ســووتن ) بێ ئەوە لــەگەڵ ( ئەبی لەهەب ) یــەك شت ئەگرنەوە [(١)] و (سووتن)یش لە بەیتی پاشەوەدا هەیە •

**سەهم و نەسیبی ئەسلیە بەحسی گیاهـ و گوڵ نییە**
**تووتنە خەرجی سووتنە مۆدنەیە ماچی لەب دەکا**

---

(١) شایانی وتنە کەوا ئەبێ (نالی) ئەوەشی مەبەست بووبێ (ئەبی لەهەب) بە (ئەبێ لەهەب)یش بخوێنرێتەوە ، کە واتە : ئارەزوو ئەکا بڵێســەی لێ هەڵئەستێ ! وشەی (هەمدەم)یش ئیشارەتی ئەوەی تیایە کە داری ئەراك ئەکرێ بە سیواكو دەمی پێ پاك ئەکرێتەوەو سیواککردن سوننەتەو بەمجۆرە داری ئەراك ئەبێ بە ( هاودەم )ی سوننەت .

مۆدنەیە : ڕاستەکەی (موودنە)یە • هاوسەنگیشی لەگەڵ (تووتنە)و سووتنە ) نیشانەی ئەم ڕاستییەیە •

**لەومی زەمان دەکەی کە بۆچ خوارییە ڕاستیی دەوێ**
**غافڵی دەستی ڕاستی خۆت خزمەتی دەستی چەپ دەکا**

خوارییە : ڕاستەکەی (خوارییی)یە ، واتە زەمانە ئەوەی ئەوێ • ڕستیی : ئەبێ بنووسرێ ( ڕاستیی ) یا (ڕاستیی) چونکە (ی)ی دووهەم ضەمیرەو ئەگەڕێتەوە بۆ ( زەمان ) •

**(نالی) حەریفی کەس نییە ئولف و ئەلیفی کەس نییە**
**بەیتی ڕەدیفی کەس نییە تەفریقە نووسە کەپ دەکا**

ئولف : ڕاستەکەی ( ئیلف )ە •

## غەزەلی ( ١٤ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٠٨ ــ ١١١ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٥٤ )

**هەر کەسێ نوقسانی ڕووی باوێتە سەر ڕووی ئایینە**
**شاهیدی هەر چەندە ڕەئیولعەینە کەی باوەڕ دەکا**

نوقسانی : ڕاستەکەی بە دوو (ی)یە یەکێکی مەصـدەریو یەکێکی ئیضافە • ئایینە : ڕاستەکەی (ئاینە)یە ئـەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ • کەی : ڕاستەکەی (کێ)یەو ئەبێ بە فاعیلی فیعلی (دەکا) کە لەدواوە دێ •

## غەزەلی ( ١٥ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١١١ـ١١٤ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٤ ــ ٥٥ )

**تا موعەییەن بێ کە زۆرن دەستگرۆیی و دەستکوژی**
**فەرقی سەر پەنجەی بە خۆناوی حەنا ڕەنگین دەکا**

دەستگرۆیی : ڕاسـتەکەی ( دەستگرییو )وە • ئـەگەر واش بێ کە دوکتۆر نووسیویە ئەبێ (دەستگرۆیو) بێ •

## غەزەلی ( ١٦ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٠١ــ١٠٦ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٥ــ٥٦)

**بلبلی تەبعم ئەوا دیسان سەنا خوانی دەکا**
**نوکتە سەنجی و بەزلە گۆیی و گەوهەر ئەفشانی دەکا**

گەوهەر : هەرچەند لە دوو نوسخەی ( عەلی موقبیل )و (گیو موکریانی )دا وا نووسراوە ، ڕاستەکەی هەر (عەنبەر)ەو لێرەدا مەبەست قسەی وەك عەنبەر بۆنخۆشە .

**خەرقەپۆشی کەی دەپۆشێ جەوهەری زاتی ئەمن**
**پێنێتێ جیلوە پەرستی خۆی بە عوریانی دەکا**

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە لە نوسخەکانی بەردەستی ئێمەدا زۆر ئاڵۆزە . ئێمە وەختی خۆی لەناو هەموو دەسنووسەکاندا ئەم تێکستەمان هەڵبژاردووە کە ئەڵێ :

**بێتە نێو ، جیلوەی ، بە زوشتی خۆی بە عوریانی دەکا**

بەڵام ئێستا من وام بە خەیاڵدا دێ ئەوەی ( چنگنیانی) کە ئەڵێ :

**پینەیی جیلوە بە زوشتیی خۆی بە عوریانیی دەکا**

لە هەموو نوسخەکان ڕاستتر بێ . هەرچۆن بێ ئەمەی دوکتۆر بێگومان هەڵەیە چونکە نە لە ڕووی ڕێزمانەوە ڕاستەو نـە مەعنـایش ئەبەخشێ . سەیرە ، لەم هەموو ئاڵۆزی‌یەدا کە دیارە ئەبێ لە نوسـخەکانی بەردەستی دوکتۆریشدا بووبێ ، ئەو ئەم تێکستە بێمەعنایەی هەڵبژاردووەو هیچیشی لەبارەی هۆی بۆچوونەکەیەوە نەنووسیوە ، وەك بڵێی هیچ تەگەرەیەك لـە ڕێگای تێگەیشتنی مەعناکەیدا نەبێ !

## تیپی ( ب )

### غەزەلی ( ۱۷ )

ە چاپی ئێمەدا : ل ۱۳۳ ـ ۱۳٦ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٦ ـ ٥۷)

**زولفەینی بەخەم مار و بە حەلقەن وەکو عەقرەب**
**شیعری لەففو نەشرن چ موشەووەش چ مورەتتەب**

بەخەم : ڕاستەکەی ( بە خەم )ە • لەفف : ڕاستەکەی ئەبێ بە (لەف) بنووسرێ ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ •

**بۆ شەهدی کەلامت کە بە ئیشرابی لەتافەت**
**لەززەت دەگەیێنێ بە دڵ و زیهنی موخاتەب**

بۆ : ڕاستەکەی (بەو)ە • کەلامت : ڕاستەکەی : (کەلامەت)ە •

## تیپی ( ت )

### غەزەلی ( ۱۸ )

(لە چاپی ئێمەدا : ل ۲٤۲ ـ ۲٤۷ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥۷ـ٥۸)

**هەڵکرا وەك شەمعی کافووری بە شەودا موو بە موو**
**وا سیاهـ ڕوو بوو بە خوێنم نوقتە نوقتە خەت بە خەت**

شەمعی : من وای بۆ ئەچم ڕاستەکەی ( مۆمی ) بێ وەك ئێمە نووسیومانە ، چونکە لەنێوان ( مۆمی )و ( موو بە مووم )دا وشەئارایییەکی جوان پەیدا ئەبێ • لە هیچکام لە دەستنووسەکانی بەردەستیشمانا نەنووسرابوو ( شەمعی ) • موو بە موو : ڕاستەکەی (موو بە مووم)ە چونکە نالی باسی خۆی ئەکا • وا سیاهـ ڕوو بوو بە خوێنم : ڕاستەکەی (دا سیاهیی ڕوو بخوێنم )ە • ئەم جۆرە هەڵانەی دوکتۆر بەڵگەی ئاشکرای ئەوەن مەعنای بەیتەکان نازانێ •

**سەرد و گەرمە ئاهەکەم سەوزەگیای کردم بە پووش**
**پاییزی ڕوو بوو بە بوردی سوور و زەردی موختەلەت**

گەرمە : ڕاستەکەی ( گەرمی )یە چونکە مەعنای بەیتەکە لەسەر گۆڕانی هەوای ئاهەکە وەستاوە • پاییزی : ڕاستەکەی ( پایزی )یە ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ •

## غەزەلی ( ١٩ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٤٥ ــ ١٤٨ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٨ ــ ٥٩ )

**شایستەیی شان ، لایقی مل توورەیی تۆیە**
**نەك توورەیی شاهنشەهییوو تەوقی وەزارەت**

توورەیی : ڕاستەکەی ( توڕڕەیی )یە چونکە لەگەڵ (توڕڕەیی)یەکەی نیوە بەیتی یەکەمدا یەکێکن و باس لە توورو توورەکەو شتیوا نییە! پاشان بۆ جاری یەکەم (توررەیی) بێو جاری دووهەم (توورەیی) بێ کە هەردوکیشیان هەر یەك وشەنو یەك واتایان هەیە ؟ شاهنشەهییوو : ڕاستەکەی (شاهەنشەهیو)وە • ئەنجا ئەم (و)ە تەنهایەی بۆچییە ؟

**سەر خاتیمەیی حوسنی عیبادەت کە نەهاتی**
**باریێ بگەیە فاتیحە وو دەئبی زیارەت**

بگەیە : ڕاستەکەی ( بگەرە )یە •

## غەزەلی ( ٢٠ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٤٨ ــ ١٥٢ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٩ ــ ٦٠ )

**ئەوە لێوی ئەتۆیە پڕ لە خەندە**
**کەوا شەککەر دەبارێ و گوڵ دەپشکوت**

دەبارێو : ڕاستەکەی ( دەباری )یە ، چونکە سەرەڕای مەعنای ڕستەکە ، عەطفی فیعلی ماضی لەسەر فیعلی موضاریع بە سەنگو ترازووی ڕێزمان هەڵەیەو ، (و)ەکەش پێویست نییەو بەپێی ڕەوانبێژی نەبوونەکەی جوانترە ، ئەبێ فاریزەیەکی لە جێ دابنرێ •

**چ شیرینە خوتووتی دەوری لێووت**
**بەلێ مەعلوومە خۆشە خەتتی یاقووت**

لێووت : ڕاستەکەی (لێوت)ە • ئەو (و)ی دووهەمەی بۆچی‌یە ؟

**هە ( نالی ) بەلکو بیکێشی بە نالین**
**بە نالە دامەنیشە مات و مەبهووت**

بە ناڵە : ڕاستەکەی ( بناڵە )یە ، ئەگینا یانێ چی ماتو مەبهووت بە ناڵەکردنەوە دانەنیشی‌و ئەی چۆن لە نیوە بەیتی یەکەمدا داوای ناڵینی لێ کرد ؟

**غەزەلی ( ٢١ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٥٢ ــ ١٥٤ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٦٠ )

**خرخالی قەدەم وەك خەمی زولفەینی سەراپات**
**پشتانی قەدت بێت و فیدای بازنی بازووت**

خرخالی : ڕاستە وشەکە لە کوردیدا ( خڕخاڵ )ە ، بەڵام لە ئەسڵدا (خلخال ــ خلخال)ەو لە هیچ‌کام لە نوسخەکانی بەردەستی ئێمەدا بە (خرخال) نەنووسراوەو دوکتۆر مارفیش لە پەراوێزەوە ئیشارەتی بۆ نوسخەیەکی‌تر نەکردووە نووسیبێتی ( خرخال ) •

# تیپی ( ح )

**غەزەلی ( ٢٢ )**

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٦٤ ــ ١٦٧ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٦٠ ــ ٦١)

**قەترەیکە لە بەحری کەرەم و ڕەحمەتی فەتتاح**
**نەك عارەقی کەرمی عینەب و شەربەتی توففاح**

قەترەیکە : ڕاستەکەی ( قەترێکە = قەترەیەکە )یە •

**بەو دنن و قەررابە کە دەکا پەششە بە عەنقا**
**نەك بەو خومی نیلە کە دەکا باخە بە تیمساح**

بەو دنن و قەررابە : ڕاستەکەی ( بەو دەننی فوراتە )یە هەرچەند عەلی موقبیلو گیو موکریانی‌یش وەك دوکتۆر مارفیان نووسیوە ، بە نیشـانەی ( خومی نیلــە )ی نیوە بەیتی دووهەمدا • بەو : ڕاستەکەی (لەو)ە هەرچەند لە چەند نوسخەیەکیشدا نووسراوە ( بەو ) •

## تیپی ( د )

### غەزەلی ( ٢٣ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ١٦٨ ــ ١٦٩ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٦١ ــ ٦٢)

**بر سر کوی خود از گریه مکن منع مرا**
**زانکه گلهای چمن منتظر یارانند**

یارانند : ڕاستەکەی ( بارانند )ەو ، بە مەعناکەیدا دیارە •••

## تیپی ( ر )

### غەزەلی ( ٢٤ )

( لە چاپی ئێمــەدا : ل ١٧٠ ــ ١٧٤ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٦٢ )

**ئەم لە سەر تەعزیم و گەورە گرتنی ئەو بێ قوسوور**
**ئەو لە سەر تەحقیر و تەخفیف و شکەستی ژارەمار**

شکەستی : ڕاستەکەی ( شکستی )یە • شکەست لە کوردیدا نی‌یە • لە فارسی‌یشدا فیعلی ماضی‌یە و لێرەدا مەصدەرمان ئەوێ و (ی)کەیشــی زیاد ئەبێ • ژارەمار : ڕاستەکەی ( زاری مار )ە وەك ئێمە نووسیومانە ، هەرچەند لە نوسخە چاپی‌یە پشت پێ‌بەستراوەکانی دوکتۆردا نووسراوە ( ژارەمار ) •

**ئەم لە جێی ئەو دادەنیشێ دەم وەکو گوڵ خەندەران**
**ئەو دەبێ هەستێ کە ئەو بێ چاو یەك و قەترە هەزار**

لەجێی : ڕاستەکەی ( بچێ )یە بە نیشانەی نیوە بەیتی دووهەمدا •

ئەو : ی دووهەمیش ڕاستەکەی (ئەم)ە بە نیشانەی مەعنایش‌و نیـوە بەیتی پێشوویشدا .

**ئەم بە چاو دوڕ و بە سەر لەعلی هەدی‌یەی بۆ دەبا**
**ئەو بە تف دەیکا بە میزابی شکستەی ئابشار**

دوڕ : ڕاستەکەی ئەبێ بە دوو (ڕ) بنووسـرێ تا نیوە بەیتەکە لەنگ نەبێ . هەدی‌یەی : ڕاستەکەی ( هەدی‌یە )یە بێ (ی)ی دوایی ، هەرچەند لە هەندێ لە نوسخە چاپەکانیشدا وا نووسراوە .

**نەزمی ( نالی ) میسلی ئاوە ئایینەی ژەنگی نی‌یە**
**دوو ڕووە بۆ سەیری خاتر یەلە خەفی ، یەلە ئاشکار**

ئاوە ئایینەی ژەنگی : ڕاستەکەی ( ئاوو ئاینە ژەنگی )یە .

## تیپی ( ز )

### غەزەلی ( ٢٥ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٢٢١ ـ ٢٢٣ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٦٣ )

**خاو و بێ خاوی دوو زولفی خاووم ئەز**
**چاوە چاوی یەلە غەزالەی چاووم ئەز**

خاووم : هەروەها ( چاووم )یش ئەبێ یەکێ بە یەك (و) بنووسرێن . دوکتۆر وشەی پێش دوا وشەی هەموو بەیتەکانی ئەم غەزەلەی ، بە هەڵە ، بە دوو (و) نووسیوە . غەزالەی : ڕاستـەکەی ( غەزالە )یە. غەزالە چاو : ئەوەیە کە چاوی وەك چاوی ئاسك وابێ .

**تازە ئەبرۆت وەسمە کێشاوە بە ناز**
**دڵ لەتی شمشێری تازە ساووم ئەز**

وەسمە : ڕاستە لە فارسیدا وا ئەنووسرێ ، بەڵام وشەکە لە کوردی‌یشدا هەیەو ( وسـمە )یە . ئیتر نازانم دوکتۆر لـەپێناوی چی‌دا دەس‌بەرداری کوردی‌یەکە بوومو پەنای بردووەتە بەر فارسی ؟

# تیپی ( ژ )

## غەزەلی ( ٢٦ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٢٤٢ ــ ٢٤٧ . لە چاپی د. خەزنەداردا : ل ٥٧ ــ ٥٨)

**بن زگ و جەبهەت سپی کلك بۆ و دامەن سیاهـ**
**یەککەناس و سێ بۆ و دوو باد و شەش دانگ و درێژ**

کلك‌بۆ : ڕاستەکەی ( کلك‌و سەر )ە . کلك‌بۆ وەك مەعنایەکی بەکەڵك نابەخشێ ، نیوە بەیتەکەیش لەنگ ئەکا .

**مل عەلەم ، شیرین قەلەم ، ئاهوو شکەم ، مەیموون قەدە**
**سم خڕ و کلك ئێستر و مەنزڵ بڕ و عارەق نەڕێژ**

مەیموون قەدە : ڕاستەکەی ( مەیموون قەدەم )ە . لەوانەشە هەڵـەکە هەڵەی چاپ بێ .

**عاقڵێ بوو ناوی کەر بوو قاتیعی ڕێگە و سەفەر**
**خۆش سولووکتربوو لەسەد ئینسانی هەرزەو گێژوویژ**

ئینسانی : ڕاستەکەی ( وێڵداشی )یە چونکە باس لە هاوڕێی ڕێیە ، هەرچەند لە چەند نوسخەیەکیشدا نووسراوە ( ئینسانی ) .

# تیپی ( س )

## غەزەلی ( ٢٨ )

( لە چاپی ئێمەدا : ل ٢٣٣ ــ ٢٣٧ . لە چاپی د . خەزنەداردا : ل ٦٦ )

**ئەمە جێی ڕەمز و ئیشاراتی دەروونە لە گەرووی**
**تونگی پڕ غەرغەرەیی واعیزی غەرا نی‌یە باس**

تونگی : ڕاستەکەی (تەنگی)یە . نالی نالێ (تونگی) . ئەگەر ئەوەشی مەبەست بێ ( توندی ) ئەنووسێ .

«٠٠ وه له بەهەشتی عەدەنی دانا ، حـەووای له پەراسووی ئـادەم دەرهێنا » [ دم ] ٠

« ٠٠ خستیه بەهەشتی عەدنەوەو حەووای له پەراسووی دروستکرد» [ مم ] ٠

بەهەشتی ( عەدن ) ــ نەك عەدەن ــ ئەو بەهەشتەیە خوا ئادەمی تیـا دانابوو ٠ ( عەدن ) خۆی به عەرەبی واته سەقامگیر بوون له شوێنێ ٠

**ئادەمی خوار :**

« مردم خوار » [ فع ، ل ٢٧ ] ٠

« ئادەمزاد خۆر ، ئینسان خۆر » [ دم ] ٠

مەعنا لێدانەوەکه ، یاخود بلێین وەرگێڕانەکه گەردی لێ نانیشـێ ٠ قسەم لەمه نیه ٠ ئەوەی ئەمەوێ بیلێم ئەوەته نالی باسی ( ئادەمی خوار )ی نەکردووه ، باسی ( ٠٠ مەغزی ئادەمی خوار )ی کردووه ، واته : ئەو مارانەی سەرشانی یار ــ که مەبەست زولفەکانیەتی ــ که مرۆڤ شـێت ئەکەنو مێشکی ئەخۆن ٠ نالی ئەڵێ :

**دو جادوو ماری مەغزی ئادەمی خواری قەرار داوه**<br>**لەسەر شانی ، وەکوو ضەححاکو ، ناوی ناوه زولفەینی**

کەواته دیاره دوکتۆر مارف زۆر ورد له نالی حاڵی ئەبێو فەرهەنگی شایانی خۆی بۆ ئەنووسێ ٠٠ له خوا بەزیاد بێ ! ٠

**ئـارا :**

« نگا ٠ آراستن » [ فع ، ل ٢ ] ٠

« ئارا (آراستن) : ئارایش ، ڕێكخستن ، جوانکردنو زینەتدان » [دم] ٠

« بڕوانەرە : ئاراستن » [ مم ] •

مەبەستی (فع) لەوەیە وشەی (ئارا) بەتەنها خۆی مەعنای نایەت • ئەبێ بە هۆی وشەی ( ئاراستن )ەوە کە مەصدەرەکەیەتی مەعنای بزانرێ • (ئارا) خۆی مەعنای (ڕازێنەوە) ئەگەیەنێ کە ئەبێ لەگەڵ ( ڕازاوەوە )کەدا پێکەوە بووترێن وەك ( جیهان ئارا ) واتە ( جیهان ڕازێنەوە ) • کەچی دوکتۆر هاتووە هەرچی مەعنایەك (فع) بۆ (آراستن)ی مەصـــدەری داناوە ، داویەتە پاڵ (ئارا)ی لە حوکمی ئیسمی فاعیلداو ، (ئارا)و (ئاراستن)ی بە یەك شـــت زانیوە ••

**ئـــاسوودە :**

« [ ص • م ] آرام ، آرام گرفتە ، فارغ ، آسایش یافتە [فع ، ل ٣٥]•

« ژیانی پڕ لە ئاسایش‌و هێمنی ، ژیانی خۆش‌و پڕ لە ئارام » [دم] •

« [ صیفەتێکە مەعنای مەفعوولی‌یەتی ئەگەیەنێ ] ئارام ، ئۆقرە گرتوو، دەس‌بەتاڵ ، حەساوە » [مم] •

وا دیارە دوکتۆر وشەی (ئاسوودە)ی لە (فع)دا نەدۆزیوەتەوە چونکە لەوێ لە سەری دێڕدا مەصدەرەکەی دانراوە کە (آسودن)ەو ئـەم خۆی کەوتووەتە ناو لقەکانی ئەوەوە • لەسەر ( آسودن )یش نووسراوە : «مص• آســایش یافتن ، آرام گرفتن ، از کار و حرکت باز ایستـــادن » • واتە : مەصدەرە • بە مەعنای ئیسراحەت کردن ، ئارام گرتن ، لـە کارو جووڵە کەوتن • دوکتۆر ئەم تێکستە فارسی‌یەی بەوجۆرە نادروستەی لە سەرەوە پیشانماندا وەرگێڕاوەتە سەر کوردی •

**ئـــاش :**

«•• نـــوع ســـادەء آن عبارت از دو ســـطح گرد و مسطحاست ••

آسیاهائی‌را که بقوهء موتور کار میکنند آسیای دودی میگویند » [فع ، ل ۳۷ ] •

« •• له دوو تاشه بەردی پان‌و خڕ پێکهاتووه • ئاشی ئاگرو ئاشی مۆتۆریش هەیە » [دم] •

« جۆره سادەکەی بریتی‌یە له دوو ڕووی خڕو تەخت • ئەو ئاشانەی بە هێزی ماتۆڕ کار ئەکەن پێ‌یان ئەڵێن ئاشی دووکەڵین » [ مم ] •

بە بەرداش ناوتریٚ تاشه بەرد • تاشه بەرد ئەو تاوێره گەورانەن بـە لاپاڵی چیاکان‌و قـەراخ ڕێگاکان‌و له گویٚ ڕووبارەکاندا هـەن • ئەبوو دوکتۆر لەجیاتیی (پان) بیوتایە (تەخت) ، چونکە (پانی)و (خڕی) ناکەونەیەك لەبەرئەوه که شتی خڕ هەموو لاکانی تـا مەرکەزی دائیرەکەی ئەوەندەی یەکن • پانی‌یش ، وەك درێژی ، لەسەر بناغەی زیادیی لایەك لەسەر حیسابی لایەکی‌تر دامەزراوه • (پێکهاتن)یش لەم جۆره شوێنانەدا ناوتریٚ •• ئەمە هەمووی سەرەڕای ئەوه که ئاش هەر ئەم دوو بەرده نی‌یە ؛ دۆلیان‌و چەقەنەو تۆپ‌و گەلیٚ شتی‌تریشە • ئاشی ئاگرو ئاشی مۆتۆریش یەکێکن •

**ئاشوفتـە :**

« بهم‌برآمده ، خشمگین ، شوریده ، پریشان حال » [ فع ، ل ۳٦ ] •

« پەرێشان ، خەمگین ، ژیانی تاڵ‌و سەخت » [دم] •

« تووڕه ، ڕقاوی یا ڕق هەستاو ، ورووژاو ، پەڕیشان حاڵ » [مم]•

دوکتۆر ( آشفته )یشی له (فع)دا نەدیوەتەوه ، چونکە لەویٚ ( آشفتن ) خراوەته سەربەندی وشەوەو ( آشفته ) کەوتووەته نـاوەوه • ئەمەیش کە نووسیویە ، وەرگێڕاتێکی نادروستی ئەوەیە کە لەویٚ لەسەر ( آشـفتن ) نووسراوه • دووریش نی‌یە ( خشمگین )ی لیٚ بووبیٚ بە ( خەمگین ) •

**ئـاغووش :**

« نامی از نامهای غلامان و بندگان ترك » [ فع ، ل ٣٩ ] •
« ناوی بەندەو غولاّمێکی تورك بووه » [دم] •
« ناوێکه له ناوەکانی بەندەو خولاّمه تورکەکان » [مم] •
واته : ( ئاغووش ) یەکێکه لەو ناوانەی که تورکان تەنها لـه بەندەو خولاّمانی دەنێن‌و له ئازادی نانێن •

**ئـاتەش :**

« آنچه که از سوختن چوب یا زغال یـا چیز دیگر بوجود میآید و دارای روشنی و حرارت میباشد » [ فع ، ل ٣٢ ] •
« ئەو شتەیه که له سووتاندنی دارو دەوەن یا شـتی‌تر پەیدا دەبێ • ڕووناکی‌و گەرمایی » [دم] •
« ئەوەیه که له سووتانی دار یا خەلّوز یا شتی‌ترەوه پـەیدا ئەبێ‌و ڕووناکی‌و گەرمای هەیه » [مم] •

**ئـالووده :**

« [ ص • م ] آغشته ، آمیخته ، آنچه که به چیزی پاك یا ناپاك آغشته شده »[ فع ، ل ٤٥ ] •
« (١) تەڕکردن ، شتێك له شتێکی‌تر وەربدرێ وەکو ئەوەی مرۆڤێك له خوێنی خۆی وەربدرێ ، تێکەلاّو • (٢) پیس » [دم] •
« تێوه تلاو ، تێکەلّ ، شتێ له شتێکی پاك یا پیسەوه تلابێ » [مم] •
دوکتۆر لێرەشدا ( آلودن )و (آلوده)ی لێ بووه به یەك • وەك چۆن دیسانەوه مەعنای مەصدەرو صیفەتی لێ ئالۆزاوه • هەرچەند ئەو مەعنایانەی

لێرەدا بۆ ( ئالوودە )ی داناون ، دەق وەك مەعناكانی (آلودن) نین ، بەڵام هێنـانە ئارای ( تەڕكردن ) نیشـانەی ئەوەیە كە مەعنـاكانی ( ئالوودە )ی ئێرە هەر مەعناكانی (آلودن)ی فارسین و بە هەڵەی وەرگێڕاون ، چونكە (ئالوودە) لە كوردیدا هیچ پێوەندێكی بە (تەڕكردن)و (تەڕی)یەوە نی‌یە • هەرچۆن بێ ، لە فارسیدا ( آلودە ) شتێكە لە شتێكی تەڕەوە تلابێ پـاك بێ یا پیس بێ‌و ، لە كوردی‌یشدا پتر مەعنای ( تێوەگلان )و (ئولفەت‌گرتن) ئەگەیەنێ‌و كەمتر بۆ شتێكی ماددیی وەك خوێن یا قوڕو شتی‌وا بەكاردێ •

**ئـاو :**

« •• در صد درجه حرارت بجوش می‌آید و در درجه صفر منجمد میشود » [ فع ، ل ١٧ ] •

«لە پلەی سەدی گەرمایی دەكوڵێ‌و لە پلەی سفری ساردی دەبیەستێ» [ دم ] •

« لە پلەی سەدی گەرمادا دێتە كوڵ‌و لە پلەی سـفردا ئەیبەستێ » [ مم ] •

لە فیزیادا پلە بەرز بێتەوە یا نزم بێتەوە هەر بە گەرما دائەنرێ • ئەڵێن پلەی گەرما ئەوەندە لە ژوور یا لە ژێر سفرەوەیە • كەواتە دوكتۆر بە هەڵەدا چووە كە هاتووە لەخۆیەوە ( ساردی )یەكی خستووەتە سەر (سفر)ەكە كە نە لە زانستدا بەكار ئەهێنرێ‌و نە لە (فع)ەكەیشا هەبوو ••

**ئەفشـان :**

« نگا • افشاندن » [ فع ، ل ١٢١ ] •

ڕژاندن ، بڵاوكردنەوە ، پەڕاگەندە كردن ، ئاشكرا كردن [دم] •

« بڕوانەرە : افشاندن » [ مم ] •

دوکتۆر مارف لێرەیشـــدا ، وەك لە گەڵێ شـــوێنیتری لەمەوپێش‌و لەمەوپاشدا ، پاشگری بە مەعنا ئیسمی فاعیل‌و مەصدەری لێ بووە بە یەك، بۆیە هاتووە بۆ زانینی مەعنای (افشان) ، لەسەر قسەی (عمید) ، گەڕاوەتەوە بۆ سەر (افشاندن)و مەعناکانی ( افشـــاندن )ی مەصدەری داوەتـــە پـــاڵ (افشان)ی پاشگری بەمەعنا ئیسمی فاعیل • لە خۆیشیەوە هاتووە مەعنای ( ئاشکرا کردن )یشی لێ زیاد کردووە‌و لەوانەیە وای زانیبێ ئەم وشـــەی (افشان)ە پێوەندێکی بە وشەی (افشاء)ی عەرەبی‌یەوە هەیە •

**ئـــەڵحەد :**

« شکاف در گور که جای سر مرده باشد » [فع ، ل ۸۹۸ ] •

« ئەو جێ‌یەیە کە لە گۆڕدا سەری مردووی لەسەر دادەنێن » [دم] •

« درزێکە لە گۆڕدا کە جێگای سەری مردوو بێ » [ مم ] •

ئاشکرایە کەوا دوکتۆر بۆ ئەم وشە عەرەبی‌یە ڕووتەیش گەڕاوەتە سەر ( فع )ی فارسی‌و بـــە هەڵەیـــش تێکستی فـــارسی‌یەکەی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی • بەڵام فارسـی‌یەکە خۆیشی هەڵەیە • ئەڵحەد ئـــەو کەندڕەیە کە لەپاش هەڵکەندنی گۆڕ لەناویەوە ڕوو بە قیبلە کەندڕ ئەکرێ‌و مردووەکەی تێ‌ئەخرێ‌و بە تەلەبەرد بەرەکەی ئەگیرێ ، ئەنجا چاڵە بۆشەکەی گۆڕەکە بە خۆڵ پڕئەکرێتەوە • ئەم جۆرە گۆڕانە لەو شوێنانەدا هەڵئەکەنرێن کە زەوی‌یەکەی ڕەقەن بێ‌و ترسی تەپینی نەبێ ، ئەگینا گۆڕ تەنها چاڵەکەیە کە لەناوەوە تەسکتر ئەکرێتەوە‌و مردووەکەی تێ‌ئەخرێ‌و ڕووەکەی بە تەلەبەرد دائەپۆشرێ‌و پاشان خۆڵی بەسەرا ئەکرێ‌و دائەگیرێتەوە •

**ئەوبـــار :**

« خوواردن : خوواردن‌و بردنی زۆر ، قووت‌دان » [دم] •

ئەمەی دوکتۆر نووسیویە گوایە وەرگێڕانی ئەوەیە کە [فع] لەسەر وشـەی (اوباریدن)ی نووسیوە ٠ لەوێ لەسـەر ئەم وشەیە نووسراوە : « بلع‌کردن ، فروبردن ، ناجاویـدە فروبردن » ، واتـە : « قـووت‌دان ، بردنەخوارەوە ، بردنە خوارەوە بـە نەجاوراوی » ٠ بەڵام نازانم دوکتۆر چ‌پێوەندیەکی لەنێوان ( ئەوبار )ی لە بنەچەدا عەرەبیی نالی‌و (ئەوباریدن)ی فارسیدا دیوەتەوەو بۆچی مەعناکەی ئەوی بە دەسکاری کراوی هێناوە بۆ ئەم ؟ بۆچی هەر هیچ نەبێ مەعنای (ئەوبار)ی فیعلی ئەمری مەصـدەری (ئەوباریدەن)ی نەهێناوە کە هەر نەبێ خۆ بە دیمەن لە یەك ئەچن! ڕاستەکەی (ئەوبار) وشەیەکی عەرەبی‌یەو جەمعی ( وەبەر = وبر )ی بەمەعنا (کورك)ە ٠

**ئیـحرام :**

« در حرم درآمدن ، حرام‌کردن چیزی ، بر خود حرام کردن بعضی چیزهای حلال‌را چند روز پیـش از زیارت کعبه و بمعنی دو تکه جامـهء نادوخته که در ایام حج یکی‌را بکمر میبندند و دیگری‌را بدوش می‌اندازند» [ فع ، ل ٦٧ ] ٠

« (١) دوو پارچە قوماشی سپی‌ی نەدووراوە حاجی‌یان لـە حەج‌دا یەکێکیان لە کەمەر دەئاڵێنن‌و ئەوی‌تریان بە خۆیان‌دا دەدەن ٠ (٢) لە حەرەم هاتنە دەرەوە٠ (٣) حەرام‌کردنی شتێك ، نەخواردنی شتێك (٤) حەرام‌کردنی هەندێ شتی حەڵاڵ لەپێش زیارەتی کەعبە بە چەند ڕۆژێك » [ دم ] ٠

« هاتنەحەرەم ، حەرام‌کردنی شتێك ، لە خۆ حەرام‌کردنی هەندێ شتی حەڵاڵ چەند ڕۆژێ بەر لـە زیارەتی کەعبە ٠ بە مـەعنای دوو پارچە جلی نەدووراویشە کە لە ڕۆژەکانی حەجدا یەکێکیان دەبەستنە پشـت‌و ئەویان دەدەن بە کۆڵدا » [ مم ] ٠

وەك دیمان ئەوەی دوکتۆر نووسیویە وەرگێڕانی ئـەوەیە کە (فع)

نووســیویە لەگەڵ هەنــدێ هــەڵەی مەعناگۆڕو جێگۆڕکێ پێ کردنی ڕستەکانا • دیارە هاتنە حەرەمو لە حەرەم هاتنە دەرەوە زۆریان لــە یەك جیایە ، هەروەها جل بە خۆدا دانو جل بە کۆڵدا دانیش جیان لە یەك •

لە ڕاســتیدا ( ئیحرام ) واتە چوونە ئەرزی حــەرەم کە پێوانەیەکی دیاریکراوە بە دەوری شاری مەککەدا • بەم چوونە ئەرزی حەرەمە چەند شتێك لەسەر هەموو موسوڵمانێكو چەند شتێکی زیاتریش لەسەر کەسێ کە بۆ حەج یا عەمرە چووبێ ، حەرام ئەبێ • ئەم حەرامبوونە بەشبەحاڵی حاجیو عەمرەکەر لەوکاتەوە دەستپێئەکا کە پاش چوونە ئەرزی حــەرەم بەرگی ئیحرام ئەکەنە بەریانو . بە داماڵینی ئەو بەرگانە ، پاش لێبوونەوە لە کاروباری حەج یا عەمرە ، دوایی دێ • کەواتە ئەو مەعنا ناتەواوەی دوکتۆر مارف لە خانەی ژمارە (١)دا باسی کردووە ، مەعنای بەرگی ئیحرامە نــەك ئیحرام خۆیو دوکتۆریشو عەمیدیش بەهەڵەدا چوون ••

**ئیخوانوسسەفا ( اخوان الصفا ) :**

« جمعية ذات طابع سياسي ديني ( نحو ٩٨٣ ) اسماعيلية النزعة • اتخذ اعضاؤها البصرة مركزا لنشاطهم •• الخ » [ مع ، ل ٢٨ ] •

«کۆمەڵەیێکی سیاسی ــ ئایینی بوو بە بیروباوەڕی ئیسماعیلی خۆی دەردەخست ، لە دەوروبەری ( ٩٨٣ ز ) لە بەسرە دروستبوو » [دم] •

کۆمەڵەیەك بوو شێوەیەکی سیاسی ــ ئایینیی هەبوو ( لە دەوروبەری ٩٨٣ی • زدا ) • ئەندامەکانی بەسرەیان کردبوو بە مەڵبەندی هەڵسووڕانی خۆیان » [مم] •

**ئیستیتاعە ( استطاعة ) :**

« سرمايه داشتن » [ فع ٩٤ ] •

« سەرمایە » [ دم ] •
« بوونی سەرمایە » ( کەسێك سەرمایەیەکی ببێ ) [ مم ] •

**ئیسنـاد ( اسناد ) :**

« نسبتدادن » [ فع ، ل ۱۰۳ ] •
« نەژاد دان » [ دم ] •
« دانەپاڵ » [ مم ] •

من لە مەعنای ( نەژاد دان ) حاڵی نابم ، هەرچەند بـە مەعنای باوی (نەژاد)و بە مەعنای ڕستە فارسی‌یەکەدا وای بۆ ئەچم مەبەستی دوکتۆر ئەوە بێ کەسێ بڵێ فلاَنکەس لە فلاَنە ڕەگەزە ، بەلاَم بۆی نەهاتبێ فارسی‌یەکەی (عمید) باش مەعنا لێبداتەوە •

**ئیشتیبـاه ( اشتباه ) :**

« مانند شدن چیزی بچیز دیگر در نظر انسان » [فع ، ل ۱۰٦ ] •
« یەکێك لە جێی یەکێکی‌تر دابنرێ بە هەڵە » [دم] •
« شتێ لە بەرچاوی بنیادەم وەك شتێکی‌تر وابێ [مم] •

نالی‌یش هەر ئەم مەعنایەی مەبەست بووە [ چ : دم ، ق ۳ ، ب ٤ ، ل ۱۳۸ ] کە (فع) نووسیویەو (دم) وا بە هەڵە مەعنای لێدایەوەو ئێمـە مەعنا ڕاستەکەیمان نووسی • تەماشـای مەعناکانی‌تری ئەم وشـەیە کە ( فع ) نووسیونی‌و (دم) کردوونی بە کوردی، ئەوەمان بۆ دەرئەخا کە ئەم ڕستەیەش هەر هیی (فع)مو (دم) بە هەڵە وەری‌گێڕاوە •

**ئیعجاز ( اعجاز ) :**

« عاجز ساختن ، ناتوان گردانیدن ، انجـام دادن کاری کە دیگران ازان عاجز باشند » [ فع ، ل ۱۱٤ ] •

« نەتوانین لە هێنانەدی کار ، هێنانەدی کارێك کە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی بۆیان نەکرێ » [ دم ] •

« بێدەسەڵات کردن ، بێتوانا کردن ، کردنی کارێ کە بە خەڵکی‌تر نەکرێ » [ مم ] •

دوکتۆر مەعنای یەکەم‌و دووهەمی کرد بە یەك ڕستەو بە هەڵەش لێکی‌دایەوە • مەعنای دووهەمیشی بەجۆرێ گۆڕێ کە وشەکە مەبەستە ئیستیلاحی‌یەکە نەگرێتەوە کە موعجیزەی پێغەمبەرانە ، چونکە موعجیزەی پێغەمبەران کارێکی لە عادەت بەدەرە بە کەسی‌تر ناکرێ لە پێغەمبەرەکە خۆی بەولاوە کە خوا بەتایبەتی بۆی ئەکا بۆئەوەی بۆی ببێ بە بەڵگە لە ئیددیعا کردنی پێغەمبەرێتی‌داو . نیشانەی ڕاستیی ئیددیعاکەی بێ لای خەڵك •

**ئیقبال ( اقبال ) :**

« پیش آمدن‌و روی آوردن بچیزی ، رو آوردن دولت ، در فارسی بمعنی بخت‌و طالع هم میگویند » [فع ، ل ١٢٤ ] •

« (١) پێشوازی کردن ، ڕوودان • (٢) بەخت ، چارەنووس ، تالع [ دم ] •

« هاتنە پێشەوەو ڕووکردنە شتێ ، دەوڵەت ڕوو بکاتە کەسێ ، لە فارسیدا بە بەخت‌و تالیعیش ئەوترێ » [ مم ] •

**ئیمکان ( امکان ) :**

« قادر گردانیدن بر امری ، پا بر جا کردن ...» • « عالم امکان : مجموع انسان ، حیوان ، نبات ، جماد » [ فع ، ل ١٣٧ ] •

« توواناییی بەرامبەر بە کارێك ، ڕێگە خۆش‌کردن ... » . « ئەمە کۆمەڵی ئینسان‌و جانەوەرو کشت‌وکاڵ‌و بێ‌گیانە » [ دم ] .

« تواناکردن ( ی کەسێك ) بەسەر کارێکا ، ڕێ بۆ خۆش کردن...». «جیهانی ئەو شتانەی کە بوون‌و نەبوونیان چونیەکە : تێکڕای ئادەمیزادو گیان‌لەبەرو شینایی‌و بێ‌گیانەکانە » [ مم ] .

**نوفتـــادە :**

« زمین خوردە ، از پا در آمدە ، فروتن ، زبون » [فع ، ل ١١٨] .

« (١) هاتنەخوارەوە لە سەرەوە بەرەو زەوی ، لە زەوی نزیك بوونەوە . (٢) زەبوون، پەك‌کەوتووە بۆ پیری بێ‌توانا بەکاردێ» [ دم ].

« کەوتووە زەوی ، لە پێ کەوتوو ، لەش داهەژیو ، زەبوون » [مم].

بەشی یەکەمی ئەم مەعنایەی دوکتۆر مارف نووسیویە لە مەعنای وشەی (افتادن) وەرگیراوە لە (فع)دا ، ئەویش بە هەڵەیەکی زۆرەوە . ئاشکرایشە (افتادن) مەصدەرەو (افتادە) صیفەتەو مەعنای ئیسمی مەفعوول ئەگەیەنێ . مەعنای ڕاستی ئەوەی لە ( فع )دا لەسەر (افتادن) نووسراوە بەم‌جۆرەیە : کەوتنە خوارەوە لە بەرزی‌یەوە ، کەوتنە زەوی . نالی‌یش باسی پیربوون‌و لێ‌کەوتنی خۆی ئەکا [ چ : دم ، موستەزاد ، ب ١ ، ل ١٦٨ ] .



# هەندێ لەو هەڵە زەقانەی ، دوکتۆر مارف لە لێکدانەوەی وشە کوردیو بــە کوردی بووەکانو هەندێ وشەیتری پیتی (( ئـ ))دا ، تووشیان بووە

**ئــاخوڕ :**

قوولایی‌یێکە لەناو دیوار یا لە قەراخی‌دا دروست دەکرێو ئالێــکی دەخرێتە ناوەوە [ دم ] •

ئالیك دەکرێتە ناو ئاخوڕەوە ، تێی ناخرێو . شوێنەکەش قوولایــی نی‌یە ، چالایی‌یە •

**ئــاخیر :**

دیارە ، بێ‌گومان ، لەوانەیە ، ئیتر [ دم ] •

هیچ‌کام لەم مەعنایانە لە کوردیــدا مەعنای ( ئاخر ) نین کە دوکتــۆر گێڕاویەتەوە بۆ سەر ( ئاخیر ــ آخر ) • هیی (ئاخیر)خۆیشی نین • (ئاخر)ی کوردی سەرەتای ڕستەی وەلامەو جۆرە بەرپەرچ‌دانەوەیەکی قسەی کابرای بەرابەر ئەگەیەنێ ، وەك ئەوە کەسێك پێت بڵێ : وەرەوە بۆ ماڵ ، تۆیــش بڵێی : ئاخر دەستم گیراوە •

**ئاریٚ ئــاریٚ :**

دلۆپ دلۆپ ، دلۆپ دوای دلۆپ ، ئــارەزووی ئاوکردن ، بە ئــاو ووتن : بەلێ بەلێ وەرە ! [ دم ] •

مەعنایوا بۆ (ئارێ) نە لـە کوردیو نە لە فارسـیدا نییە • مەگەر دوکتۆر خۆی بزانێ لەکوێوەی هێناوە • ئەنجا ئاخۆ چۆن بە ئاو ئەوترێ : بەڵێ بەڵێ وەرە ؟ چۆن دێت ؟

**ئاردەلووك ( ئاردەلووکە ) :**

وردەی بەفر ، وردە بەفر ، زەڕزاتی بەفر [ دم ] •

ئاردەلوك [ نەك ئاردەلووك ] لە کوردیدا بەو وردە ئاردە ئەڵێـن لەژێر بەرداشەوە بەرز ئەبێتەوەو لە دەوروبەریدا جێگیر ئەبێتەوە • لـە بەیتەکەی نالیدا [ چ : دم ، ق ٥ ، ل ١٤٦ ] بۆ ئەو وردە خوێیە بەکارهێنراوە کە بەهۆی ئاوەوە لەسەر خاکی ژوورەکە پەیدا بووە •

**ئـاسمان :**

چەرخو فەلەك [ دم ] •

تەنانەت بە کینایەش لە کوردیدا بە ئاسمان نەوتراوە چەرخو فەلەك ، بەڵام بە گەردوون وتراوە •

**ئـاگرە سوورە :**

پشکۆ ، پەنگر ، پۆلوو ، ئەو ئاگرە کەمەی کە دەخوازترێ بۆئەوەی ئاگریتری پێ بکرێتەوە [ دم ] •

ئاگرە سوورە لە کوردیدا بە موتڵەقی ئاگر ئەوترێو ، بە کینایە لـە بەڵایەکی ناگەهان کە بەگورجی بەسەر کەسێکدا بێ ــ بەکارئەهێنـرێ • کورد ئەڵێن : « ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە » •

**ئـاگربەردان :**

سووتاندنی شت بە ئاگر [ دم ] •

کورد ئەڵێن « ئاگر تێبەردان » یا «ئاگر بەردانەوە» • هەرچەندیش سووتاندن هەر بە ئاگر ئەبێ ، بەڵام ئاگر بەردانـەوە مەعـنای گەورەیی ئاگرەکەی تیایە کە پێوانەیەکی زۆر بگرێتەوە • ئەو مەعنایەی دوکتـۆر گوتوویەتی ئەوەش ئەگرێتەوە کە پارچە قاقەزێك بە هەڵگڕاندنی دەنـکە شقارتەیەك بسووتێنی ، کەچی لە کوردیدا بەوە ناڵێن ئاگر بەردانەوە •

**ئـالی عەبـا :**

مەبەس کەس‌وکارو نەوەو ئالی پێغەمبەرە [ دم ] •

ئالی عەبا بە حەزرەتی عەلی‌و فاطیمەو حەسەن‌و حوسەین ئەڵێن کـە پێغەمبەر (د) عاباکەی داوە بەسـەر خۆی‌و ئەواندا • (فع)یش بە ڕاسـت مەعنای لێداوەتەوە [ ل ٤٤ ] ، بەڵام دوکتۆر وادیارە بە پێویستی نەزانیوە تەماشای بکا •

**ئـالەت :**

هەموو شتێکی کە بەهۆی ئەوەوە کارێك بگاتە ئەنجام [ دم ] •

ئەوە ( ئالەت )ە نەك (ئالەت) • (ئالەت) ئەوەیە کە دوکتۆر مەعنـای دووهەمی بۆ داناوەو بەوجۆرە (ئاڵەت)و (ئالەت)ی کردووە بە یەك شت •

**ئـاڵو واڵا :**

سوورو بڵند ، سەوزو سوور ، ڕەنگاو ڕەنگ [ دم ] •

تەنها مەعنای سێهەمیان ڕاستە •

**ئـاوا :**

•• وونبوونی ڕۆژو مانگو ئەستێرە ، وونبوونی هەموو شتێـك لەبەر دووری یا کەوتنی بە دیوێکیتر [دم] •

ئەمەی دوکتۆر باسی لێ ئەکا ( ئاوابوون )ە نەك (ئاوا) • (ئاوا) بـە (ئاوابوو)ەکە ئەڵێین • لەگەڵ ئەوەشدا (ئاوابوون) (ونبوون) نیـیە بـە گشتی ، ئەوەتە ئێواران یا شەو ڕۆژ یا مانگ یا ئەستێرە لـە ئاسـۆوە ون بین • بۆ نموونـە ئەگەر ڕۆژ یا مانـگ یا ئەسـتێرە بکەونـە بەر پەڵـە هەورێکەوە ، ناوترێ (ئاوابوون) ، یا ئەگەر نیوەڕۆ لە شوێنێکدا خـۆر بکەوێتە پشتی شاخێکەوە ناڵێین (خۆر ئاوا بووە) ، ئەڵێـن ( خـۆر لـەو شوێنە ئاوا بووە ) • هەروا (ئاوابوون) بۆ دوورکەوتنەوەی شتێك ، وەك شەمەندەفەرێك ، بەکارناهێنرێ • بەڵێ بە کینـایە ئەوترێ : ئەسـتێرەی بەختی فلان کەس ئاوا بووە •

**ئـاوات :**

ئامانج [ دم ] •

ئاوات ئامانج نیـیە • ئامانج کاری بۆ ئەکرێو هەوڵی بۆ ئـەدرێ ، کەچی ئاوات بە دڵدا دێو شتێك نیـیە لەژێر دەسەڵاتی ئادەمیزاد خۆیدا بێ•

**ئاوەدان ( ئاوەدانی ) :**

(١) ئاوەدانکردنەوە • ئاوەدانکردنەوەی شارو گوند • (٢ ) گوند ، دێ ، هەر جێگەیێکی ئاوو کشتوکاڵو سەوزیو ژیانی لێ بێ [ دم ] •

(ئاوەدان)و (ئاوەدانی) جیان لە یەك • مەعنای یەکەمیـش مەعنـای هیچیان نیـیە • مەعنای دووهەم مەعنای (ئاوەدانی)یە • (ئاوەدانی) شوێنەو (ئاوەدان) صیفەتیەتی • بۆ نموونە ئەتوانرێ بووتـرێ : ئەم ئاوەدانیـیە ئاوەدان نیـیە ، واتە ئەوەندە وێرانە وەك وێرانی ڕاستەقینە وایە •

**ئـاووس :**

زگ‌پڕی هەموو گیانداڕێکی چوار پێ [دم] •

ئاوس بۆ ئافرەتی زگ‌پڕیش بەکاردێ •

**ئـاهوو سـەف :**

ڕیزی مامز ، مێگەلی مامز [دم] •

ڕیزبەستوو وەك مامز کە ڕیز ببەستن •

**ئـاهوویی بەڕ :**

مامزە کێوی ، مامزی کێوی ، مامزی وەحشی [دم] •

ئاسکی دەشت کە ڕێگا زوو ئەبڕێ •

**ئـایەت :**

•• هەر یەکێك لە ڕستەکانی قورئان [دم] •

ئایەت بە هەر کۆمەڵـە وشـەیەکی قورئـان ئـەوترێ کە بەهـۆی جیاکەرەوەیەکەوە لە کۆمەڵە وشەیەکی‌تری جوێ بوویێتەوە • جا وائەبێ ئەم کۆمەڵە وشەیە تەنها یەك ڕستەی واتـابەخش ( جملة مفیدة )یـان لێ پێك‌دێ یا زیـاتر •

**ئەحرامی ئەدەب :**

بارەگای ئەدەب ، پێویستە ئەو شتە یا ئەو جێگەیەی بەرهەمی ئەدەبی لەسەر یا لێی دەنووسرێتەوە پیرۆزو پارێزراو بێ [دم] •

وشەکە ( ئیحرامی ئەدەب )ەو تێکڕای مەعناکەی دوکتۆریش هەڵەو بێ‌شوێنە • مەبەست لە ئیحرامی ئەدەبیش ئەوەیە وەك چۆن کەسێك بـۆ حەج چوویێتە ئیحرامەوە هەندێ شتی لێ حەرام ئەبێ ، نالی‌ش بەهـۆی

بوونیەوە لە حوزووری یاردا ئەدەبکردنێکی تایبەتیی لەسەر پێویست بووەو ، وەك لە ئیحرامی ئەدەبکردنا بێ ، ناتوانێ جۆرە قسەیەك بکا ناحەزو بەدکاری پێ دەمکوت بکا .

**ئەحمەق :**

.. ترِن [ دم ] .

لە کوردیدا هەیە بە کەسێ کە قسەی بێجێو زیاد لە خۆی بکا ، ئەڵێن «ترِنە» یا «قسە ترِنە» .. بەڵام نەبیستراوە بە کەسێ کە ئەحمەق و بێئەقڵ بێ بڵێن « ترِنە » .

**ئەحمەدی مورسەل :**

یەکێکە لە ناوەکانی محەمەد کوڕی عەبدوڵڵای پێغەمبەری موسوڵمانان [ دم ] .

وا نیِیە . تەنها ( ئەحمەد )ەکە ناویەتی . مورسەل ، کە واتە فروستادەی خوا ، صیفەتیەتی .

**ئەزەل :**

ئەوەی سەرەتاو دووایی نیِیە ، هەر بووەو هەر دەبێ [دم] .

وا نیِیە . ئەزەل واتە کۆنی ، بێ سەرەتایی . ئەوەی کە سەرەتای نەبێ پێیئەڵێن (ئەزەلی) . ئەوەیش کە دوایی نەبێ (ئەبەدی)یە .

**ئەسغەران :**

دڵو زمان [دم] .

ئەسغەران : واتە دوو بچووکەکە . کینایەیە لە دڵو زمان .

**ئەشکی ڕەوان :**

فرمێسکی زۆر بە خوڕ [ دم ] •

ڕەوان : واتە جاری • ئیتر نە زۆرو نە بە خوڕی تیا نی‌یە •

**ئەشکڕێــژ :**

ئەوکەسەیە کە دەگری ، ئەوکەسەیە کە فرمێسك دەڕێژێ • [دم] •

نالی باسی (مۆم) ئەکا [ چ : دم ، غ ٨١ ، ب ١١ ، ل ١٠٧ ] ، ئــیتر بۆچی ئەبێ ئەشکڕێژ (کەس) بێ ؟

**ئەلواحی ئەلحەد :**

ئەو بەردەیە کە سەری مردووی لەسەر دادەنرێ لە گۆڕدا [دم] •

ئەمەش هەڵەیە • ئەلواحی ئەلحەد بەو تەلە بەردانە ئەڵێن کە بە لاپاڵی کەندڕی ناو گۆڕەکەوە ، لەنێوان مردووەکەو چـاڵی گــۆڕەکەدا قنــج دائەنرێن ، ئەوجا چاڵەکە پڕئەکەنەوە ، یا ئــەگەر مردووەکە لە چاڵــەکەدا ڕاکێشرابوو سەری چاڵەکەیان پێ ئەگرن ، وەك لە وشــەی (ئەلحــەد)دا ڕوونمان کردەوە • دیارە دوکتۆر مارف ئەو قسە کوردی‌یەی نەبیستووە کە ئەڵێ : «•• مەگەر کاتێ کە لووتم ئەدا لە بەردی ئەلحەد » •

**ئــەمەل :**

ئارەزوو • ئامانج [ دم ] •

ئەمەل ئومێدو هیوایە ، ئارەزوو و ئامانج نی‌یە •

**ئەنجومی قوبوور :**

ئەستێرەی گۆڕستان • ئەستێرەی مردووان [ دم ]•

ئەم دوو وشەیە لە بەیتەکەی نالیدا [ چ : دم ، ق ٤ ، ب ٢٥ ، ل ١٤٢]

بەتەنها خۆیان مەعنایان لێ نادرێتەوە ، تا بەمجۆرە بێ کە دوکتۆر مـارف نووسیویە ، پێویست بە تێکڕای بەیتەکەو بەتایبەتی بە وشەی ( دائیرەیی ) هەیە کە لەپێشیانەوەیە ، واتە : ئاخۆ سەیوان وەك جاران وایە ، یاخـود بووە بە خولگەیەکی پڕ لە ئەستێرە کە ئەستێرەکانیش قەبرەکانن ؟

**ئەنگووتن :**

شنە ، شنەیبا [ دم ] .

شنەی با ئەنگوێ ، هەڵئەکا ، ئەپێکێ ، بەڵام ئەنگووتن نی‌یە ..

**ئەو خوارە :**

ئەو جێ‌یەی لەو نزیکەوەیە ، جێ‌یێکی نزیکی‌وا ئەگەر ئادەمزاد بی‌یەوێ سەری بدا زۆری پێ ناچێ‌و دێتەوە (دم) .

ئەمەی دوکتۆر نووسیویە مەعنای (ئەو خوارە) نی‌یە لە کوردیدا . (ئەو خوارە) ئیشارەتە بۆ شوێنێ کە بەنیسبەت شـوێنی کابرای قسـەکەرەوە کەوتبێتە لای خوارو لێژی‌یەوە ، با دووریش بێ . لە کوردستـان ئەڵێن : کوڕەکەمان لەم خوارە سەربازە ، واتە لە شارەکانی بەشـی خـوارووی عێراق .

**ئەوزاع :**

کۆمەڵی خەڵك . تیرە [ دم ] .

تێ ناگەم دوکتۆر باسی چی ئەکا !

**ئەووەڵ :**

دونیـای یەکەم [ دم ].

ئەووەڵ بەتەنها خۆی قەت مانای دونیای پێوە نی‌یە .

**ئیبنولحاجیب :**

له نووسینه هەره گرنگەکانی (کافیه) له نەحوو ، (شافیه) له سەرف ، (موختەسەر) له فیقهـ [دم] ٠

موختەسەر له ئوصوولی فیقهدایه ، نەك له فیقهدا ٠ له جێی خۆیدا بوو دوکتۆر باسی ئەوەشی بکردایه کەوا ئیبنولحاجیب کوردە ٠

**ئیحیـــاء ( احیاء ) :**

کۆی ( حەی = حی )ە ، (١) زیندوو ، زیندوو کردنەوه ، دژی مردن٠ (٢) ئاوەدانی ، گوند ، گەڕەك ، هەوار [دم] ٠

بەداخەوه دوکتۆر نەك هەر حاڵی لەگەڵ فارسی‌یەکەدا شڕه کە گلەیی لێ ناکرێ ئەگەر نەیزانێ ، هەرچەند هەر له کۆڵیشی نابێتەوه ، عەرەبی‌یەکەشی ئەوه نی‌یە بنیادەم دڵی پێ خۆش کا ، ئەگینا تو خـــوا کەی ڕەوای هەقـــە کەسێ پتر له بیست ساڵ لەمەوبەر بەشی عەرەبیی زانکۆی تەواوکردبـێ ، ( ئیحیاء )و ( ئەحیاء ) بکا به یەك‌و مەعناکانیان وا تێکەڵ‌و پێکەڵ بکا ٠

ئیحیاء مەصدەری « ئەحیا یوحیی = أحیی ، یُحـــیي ، احیـــاءً »ە ٠ ئـــەحیائیش جەمعی (حەی)ە ٠ ئیحیاء واته زیندووکردنەوه ، دژی ماندن نەك مردن ٠ ئەحیائیش واته کۆمەڵە زیندوویەك ، کۆمەڵە گوندێك ، کۆمەڵە گەڕەکێك ، کۆمەڵە هۆزێك ٠٠ تاد ٠٠

**ئیخـــلاف :**

بەڵێنی به درۆ [دم] ٠

ئیخلاف واته بەجێ‌نەهێنانی بەڵێن ٠

**ئیفك : ( الافك ) :**

گوناهـ ، خەتا ، خراپە ، خستن ، زاڵبوون [دم] ٠

سێ مەعنای پێشوو مەگەر بەوەدا بلێین ڕاستن کە (افك) واتە (درۆ)و درۆیش گوناهەو خەتایەو خراپە • مەعنای چوارەم‌و پێنجەمیش فەرهەنگی عەرەبی نایانگرێتە خۆی •

**ئیــلاهـ ( الــه ) :**

خودا ، ئەوەی دەپەرسترێ [دم] •

(خودا) لە کوردیدا (ئیلاهـ) نی‌یە ، ( الله ــ ئەڵڵاهـ )ە • (ئیلاهـ )و ( ئەڵڵاهـ ) جیان لە یەك • (ئیلاهـ) بە پەرستراو ئەوترێ بێ‌گوێ‌دانە ئەوە کە (حەق) بێ یا (بەتاڵ) بێ، بەڵام (ئەڵڵاهـ) تەنها بە پەرستراوی (حەق) ئەوترێ• (خودا)یش وا ناناسێنرێ کە (ئەوەیە دەپەرسترێ) چونکە ئەوەی دەپەرسترێ گەلێ زۆرتر ئەگرێتەوە لە (خوا) کە لە کوردیدا بە زاتێکی تایبەتی ئەوترێ کە بە حەق ئەپەرسترێ •

**ئینتیخــاب :**

هەڵبژاردنی شتێك لەناو شتێکی‌تر [دم] •

شتێك لەناو شتێکدا هەڵنابژێررێ ، لەناو چەند شتێکدا هەڵئەبژێررێ• شتێك لە شتێکی‌تر هەڵناوێررێ ••

**ئینسانی هەرزە :**

کەسی بێ‌هوودە ، کەسی بێ‌کارە ، کەسێك بە قوولی تەماشای ژیان نەکاو بیر لە گوزەران نەکاتەوە [دم] •

ئەمانە هیچیان مەعنای (هەرزە) نین‌و نالی‌یش هیچ‌کام لەمانەی مەبەست نەبوە [ چ : دم ، غ ٦٦ ، ب ٥ ، ل ٩٦ ] • هەرزە واتە بەرەڵڵا کە کەسێکی نەبێ ڕێی چاك‌و خراپی بۆ دیاری بکاو بە ئارەزووی خۆی بجوولێتەوە • (هەرزەکار)یش لە بنچینەدا هەر بەم‌مەعنایەیە •

# هەندێ لەو مەعنایانەی
# لە پیتی (( ئـ ))ی فەرهەنگەکەدا نەوتراون

| وشە | مەعناکەی | شوێن |
|---|---|---|
| ئاتەش بە کەف | تفەنگچی | غ ٥٢ ، ب ٤ ، ل ٨٤ |
| ئاسوودە | کەسێك کە ئاسوودە بێ | غ ٧٠ ، ب ٦ ، ل ٩٩ |
| ئەسەر | ئــەنجام | غ ٦٥ ، ب ١ ، ل ٩٥ |
| ئاشوفتە | پرژو بڵاو | ق ٢ ، ب ٩ ، ل ١٣٧ |
| ئاشووب | مایەی ئاشووب | غ ٥٢ ، ب ١ ، ل ٨٤ |
| ئــال | موسوڵمانانی بەنی هاشم‌و بەنی موططەلیب | ق ٧ ، ب ٦٧ ، ل ١٥٨ |
| ئالۆز | توورە | غ ٧٩ ، ب ١ ، ل ١٠٤ |
| ئالۆزاو | شێواو ، تێکچوو | غ ١٠٠ ، ب ٢ ، ل ١٢٣ |
| ئــاو | ئاوی خەنجەر | غ ٨٧ ، ب ٢ ، ل ١١٢ |
| ئالوودە | تێوە تلاو | غ ١٧ ، ب ٥ ، ل ٥٧ |
| ئەحقەر | سووك‌و بێبایەخ | ق ٦ ، ب ٣٥ ، ل ١٥٠ |
| ئــەو | ئێـــمی ئیشارە بۆ نادیار | ق ٦٠ ، ب ١ ، ل ٩١ |
| ئوموور | کاروبار | ق ٤ ، ب ٢٠ ، ل ١٤٢ |
| ئەیمەن | ئەمین | غ ٩١ ، ب ٤ ، ل ١١٦ |
| ئەییام | سەردەم | غ ٧٥ ، ب ٤ ، ل ١٠٢ |
| ئــەهل | خەڵك ، دانیشتووان | غ ٨٨ ، ب ٣ ، ل ١١٣ ( هەروا شوێنیتریش ) |
| ئەوج | ئاوازێکی مۆسیقا | غ ٦٤ ، ب ٦ ، ل ٩٤ |
| ئەوج | لووتکە | ق ٧ ، ب ١٠ ، ل ١٥٣ |

| | | |
|---|---|---|
| ئیدیعا | نیسبەتدانی شتێك بۆ لای کەسێك | غ ١٦ ، ب ٤ ، ل ٥٥ |
| ئیستیعلا | مەعنای ( عـەلا = علی )ی حەرفی جەڕ . | ق ٣ ، ب ١٨ ، ل ١٤٠ |
| ئیسلام | موسولمانان | غ ٧٣ ، ب ٢ ، ل ١٠٠ |
| ئیقبال | ڕوو تێکردن (شتێ ڕووبکاتە تۆ یا تۆ ڕووبکەیتە شتێ ) | غ ٩٤ ، ب ٢ ، ل ١١٨ ( هەروا شوێنیتریش ) |
| ئیلتیجا | تـکا | ق ٦ ، ب ٤٠ ، ل ١٥٠ |
| ئینتیخاب | هەلبژاردە | غ ٦٢ ، ب ١ ، ل ٩٢ . |

★ ★ ★

# هەندێ لەو وشانەی لە دیوانەکەدا هەنو لە فەرهەنگەکەیدا نــین [(١)]

| وشــە (٢) | شوێن (٣) |
|---|---|
| ئابڕوو تکاو | ق ٥ ، ب ١١ ، ل ١٤٦(٤) |
| ئاسەف سەف | غ ٦٧ ، ب ٦ ، ل ٩٧(٥) |
| ئاگرکردنەوە | غ ١٠٩ ، ب ٧ ، ل ١٣٣ |
| ئــاڵ | غ ١٠ ، ب ٣ ، ل ٥١ |
| ئــاڵ | ق ٧ ، ب ١٤ ، ل ١٥٤ |
| ئالەتی تەقریر | ق ٣ ، ب ١٤ ، ل ١٣٩ |
| ئالەتی عەمەل | ق ٣ ، ب ١٥ ، ل ١٣٩ |
| ئاوابوون | غ ٥٦ ، ب ١ ، ل ٨٨ |
| ئاوی دیدە | غ ١٠٥ ، ب ٦ ، ل ١٢٩ |

(١) لەناو ئەم وشـانەدا ، ئەو وشـانەیان کە لە دوو پارچە پێکهاتوون، زوربەیان یەکە یەکەی پارچەکانیان لە فەرهەنگەکەدا هەن . بەڵام چونکە بەوجۆرە مەعنای مەبەسـت نادەن بەدەسـتەوە ، نەمانتوانی بە بوویان بژمێرین . جگە لەم وشانە وشـەیتریش زۆرە کە لە فەرهەنگەکەدا نین ، بەڵام لەبەر بوونی وشـەیوا کە لەگەڵ ئەو وشـانە یەك ڕیشـەیان هەبێ یا پێوەندییەکیان پێکەوە هەبێ ، بە پێویستمان نەزانی باسیان بکەین .

(٢) بەپێی شوێنی ڕێکخسـتنیان لە فەرهەنگەکەدا ، ئـەگەر دوکتۆر مارف خۆی دایبنانایە .

(٣) لە « دیوانی نالی »یەکەی دوکتۆر مارف خەزنەدار خۆیدا .

(٤) ق : قەصیدە . ب : بەیت . ل : لاپەڕە ، بەپێی تێکسـتی دیوانەکەی دوکتۆر خۆی .

(٥) غ : غەزەل .

★ ★ ★

---

(٦) م : موستەزاد .

# دِفَاعاً عَنْ الأدَبْ ..
# دِفَاعاً عَنْ "نَالي" ..

"ديوان نالي وقاموس نالي" للدكتور معروف خزندار
في كفة الميزان النقدي

« دفاعا عن الأدب .. دفاعـا عن نـالى .. » هذا هو العنوان الذي اخترته لكتابي هذا الذي الفته لانقد به كتاب الدكتـور معروف خزنـدار « ديوان الشاعر الكردي نالى ( ١٨٠٠ ــ ١٨٥٦ ) ومعجم ديوان الشاعر » الذي وصفه بأنه « بحث ودراسة وتحقيق » ، ولكنه ــ كما تبرهن على ذلك الموضوعات التي أطرحها في هذه الورقـات ــ يفتقر الى أوليـات البحث والدراسة والتحقيق حسب المفهوم العلمي المتداول لهذه المصطلحات ..

يتضمن كتاب الدكتور خزندار مقدمة في ٢٦ صفحـة وهي القسـم الاول من الكتاب ويقول عنه أنه « عرض وتحليل وتقييم لطبعات الديـوان المختلفة والنسخ المخطوطة التي توافرت » لديه . أما القسـم الثـاني من الكتاب فهو ديوان الشاعر ، ويقول الدكتور عن هذا الديوان انه « اعتمد في تقريره النهائي للنصوص الشعرية وتثبيتها على مصادر كثيرة من طبعـات الديوان والمخطوطات الفريدة التي دونت في أوقات مختلفة » . ويقول عـن منهجه في اختيار النص الصحيح انه اختيار «أقرب تلك النصوص الى الجو الشعري للشاعر ، وأما في حالة وجود اختـلاف بين نـص ونـص آخر أو نصوص اخرى فقد دون تلك النصوص في الحواشي أيضا » . ويقول عـن قسمه الثالث والاخير انه « معجم لديوان الشاعر ، يتنـاول شرح وتفسـير جميع الكلمات والمفردات والمصطلحات والتعـابير الشعريـة التي وردت في النصوص . ان جانبا كبيرا من تلك المفردات هي مشتركة وردت في الشعر الكلاسيكي للشعوب الاسلامية . فالمعجم هو ليس لديوان نالى فقـط أو

لديوان الشعر الكلاسيكي الكردي وانما يمكن الافادة منه حتى لتفسير جوانب مهمة في الادب الكلاسيكي للشعوب الاسلامية المختلفة ، هذا بالاضافة الى كونه معجما لتفسير ديوان الشعر الكلاسيكي الكردي منذ بدايته والى نهايته التي تمتد الى مابعد الحرب العالمية الاولى » [١] .

ويشتمل الكتاب كذلك على خاتمة ، كتبها الدكتور خصيصا للدفاع عن نفسه ازاء أي تهمة قد توجه اليه بشأن سكوته عن الاشارة بكلمة واحدة الى طبعة اخرى لديوان نالى أعدها والدي الشيخ عبدالكريم المدرس و أخي فاتح وراجعتها أنا مراجعة زيادة وتنقيح [٢]. فقد نالت هذه الطبعة التي جاءت متكاملة الى حد كبير حسن تقدير المعنيين بالادب في الاوساط الثقافية للشعب الكردي ، وقد صدرت قبل صدور طبعة الدكتور معروف خزندار بسنة ، ومع ذلك فقد أهمل الدكتور الاشارة اليها تماما الا في هذه الخاتمة التي ألحقها بكتابه ، زاعما أن كتابه قد اكتمل قبل صدور طبعتنا بوقت طويل ، وأن هذه الطبعة ما كانت لتصبح مصدرا له حتى وان تأخر صدور

---

(١) الفقرات الموضوعة بين اقواس صغيرة مقتبسة من الملحق العربي لكتاب الدكتور معروف خزندار نفسه .

(٢) اعتمدنا في تحضير هذه الطبعة على اكثر من ١٢ مخطوطة اضافة الى طبعات الديوان وقد صدرناها بمقدمة مسهبة في أكثر من ٧٠ صفحة . تتلوها القصائد التي رتبناها حسب الحروف الهجائية ، وقد علقنا على كل بيت من ابياتها بتفسير مفرداتها التي بحاجة الى تفسير. يتلوه شرح مفصل للبيت فبيان الاشارات الدينية والعلمية والتاريخية وغيرها التي قد توجد فيه ، ثم بيان الفنون البلاغية المختلفة الموجودة فيه ، وفي ختام كل بيت ثبتنا الاختلافات الموجودة في النسخ المختلفة التى كانت بين أيدينا . وقد اخترنا نص المتن من بين جميع النصوص حسب فهمنا للأحسن بين كلها، وان كان ذلك بطريق التلفيق بين عدة نسخ في آن واحد . وفي الختام ثبتنا أحسن ما كتب من قبل عن نالى في الكتب والصحف والمجلات الكردية ، كما تحدثنا باسهاب عن خصائص النسخ التى كانت لدينا ، و ينتهي الكتاب بخاتمة نقدية و ببعض الايضاحات اللازمة .

طبعته هو سنتين أخريين ، وقد وثق ادعاءه هذا بوضع تاريخ (١) نيسان ١٩٧٥ في ذيل مقدمة كتابه ، وقد كان غرضه من هذه القضية التي أثارها دونما مبرر تفادي الاعتراف بأنه اقتبس من طبعتنا عدة قصائد لنالى لم يسبق لاحد أن نشرها ، وكأن هذا الاقتباس ، اذا وقع فعلا ، يعتبر بمثابة نقيصة له ولعمله والامر بالعكس تماما كما يقر بذلك كل الذين يعطون للعمل العلمي معناه الحقيقي .

و قد ضمن الدكتور خاتمته هذه بعض الطعون الى طبعتنا ، منها أنها انما تتجه الى بيان الاشارات القرآنية والدينية في شعر نالى و ذكر المحسنات البلاغية ، مما يعرفه أي ( ملا ) أو متخرج من قسم اللغة العربية في كليات الاداب ، في حين أنه عنى بتحقيق النصوص الشعرية أكثر من عنايته بأي شيء — وسنعلم فيما بعد أي تحقيق هو هذا الذي عنى به الدكتور — و ذكر في معجمه كل معانى المفردة ، وعلى القاريء أن يستخدم علمه وذكاءه للعثور على المعنى المطلوب ، الذي سنبين أن الدكتور نفسه عجز عن العثور عليه في أكثر موارد استعمال المفردات ، كما عجز عن التوصل الى الاشارات القرآنية والدينية وفهم المحسنات البلاغية بل وحتى عن قراءة الايات القرآنية التى ضمنت بعض الابيات بصورة صحيحة ، مع كونه متخرجا من القسم العربي في دار المعلمين العالية ببغداد منذ أكثر من عشرين سنة ، فضلا عن حمله الدكتوراه في الادب الكردي منذ حوالي خمسة عشر عاما ...

لقد تصفحت كتاب الدكتور معروف خزندار بعناية ، فوجدته — والحق أولى أن يقال — مليئا بالثغرات والهفوات والاخطاء الكبيرة والصغيرة ، ولذلك فقد رأيت من واجبي كأحد العاملين في حقل التراث الادبي الكردي أن أقدم الى القراء نقدا بناء منصفا مما يقتضيه لا مقام نالى وحسب في الادب الكردي ، بل والحرص كذلك على عدم افساح المجال لحشو ادمغة أبناء الجيل الصاعد البعيد عن قضايا التراث بالاخطاء . ولذلك فقد بدأت أناقش

القضايا التي تطرق اليها الدكتور في مقدمته وما زعمه من أن النص الذي اختاره لأشعار نالى هو أصح النصوص وأقربها الى روح الشاعر . كما درست قاموسه كلمة كلمة مقارنا مفرداته بنظائرها في (قاموس العميد) ( فرهنگ عميد ) و(المنجد في اللغة والاعلام) وتوصلت الى تحديد الاخطاء الكثيرة التي نادرا ماتخلو منها كلمة واحدة من كلمات القاموس ، وناقشت كذلك عرضه العربي للكتاب وخاتمته التي أشرت اليها آنفا و ثبتت الاستنتاجات القاطعة التي توصلت اليها بعد عدة أشهر من العمل المضني ، كما اتخذت من حرف ( ئـ ) من قاموسه مشرحة عامة لاخطائه التي تشمل عدة أبواب .

و بودي أن أذكر في هذه الصفحات القلائل رؤوس أقلام لبعض ما تضمنه كتابي هذا ، لعل ذلك يلقي ضوءا أمام أنظار القراء العرب على مدى ما توافر في كتاب الدكتور خزندار من مفاهيم « البحث » و « الدراسة » و «التحقيق». وانى لأشكر سلفا كل من يرشدني الى زلل وقعت فيه في محاولتي بيان مواضع الزلل في الكتاب المذكور .



أرخ الدكتور معروف خزندار لميلاد الشاعر نالى و وفاته بـ ١٨٠٠ ـ ١٨٥٦ ميلادية . و قد برهنت على عدم امكان معرفة تاريخ ميلاد الشاعر ، ذلك لانه ابن فلاح ولد في بيئة متخلفة مما ينفي أي امكانية لتثبيت تاريخ ميلاده ما لم يعثر عليه مدونا على ظهر كتاب مثلا ، و هو ما لم يدعه أحد حتى الان . أما بشأن تاريخ وفاته فقد برهنت على أنه لم يمت في سنة ١٨٥٦ و لا في عمر يناهز الستة والخمسين عاما ، ذلك لان شهودا موثوقين رأوه في مكة المكرمة في ١٢٨٨ من الهجرة ( ١٨٧١ ـ ١٨٧٢ ) ولانه ذكر في قصائد عديدة له أن شعره ابيض من الشيخوخة وأنه بات عاجزا وبلغ من الكبر

عتيا أو أن عينيه عميتا أو باتتا في حكم العمياوين بسبب العجز ، فضلا عن أن هذا التاريخ لا يفصله عن سقوط الامارة البابانية الا ثلاث سنوات وهي لاتكفي بأي حال للاحداث الكثيرة التي مرت على الشاعر بعد سقوط هذه الامارة والتي سجلها في شعره • ومما تجدر الاشارة اليه أن الدكتور لم يأت بدليل واحد للبرهنة على ما ذكره بشأن ميلاد الشاعر و وفاته •

و قد ناقشت كذلك ما قاله الدكتور خزندار من أن نالى ترك السليمانية قبل انقراض العهد البابانى ، ودحضت ما قاله مبرهنا على ما ذكرت بقصائد نالى نفسه التى يناشد فيها نفسه أن يترك ديار الظلم والخراب • وما هذه الديار الا السليمانية التي استولى عليها العثمانيون اذ أنه كان من مقربي آخر أميرين بابانيين هما سليمان باشا و أحمد باشا •

تحدث الدكتور معروف خزندار في مقدمته كثيرا عن اكثر من ٢٠ مخطوطة كانت بحوزته ، و كيف أنه قارن بينها و خرج من تلك المقارنات كلها بالنص الذي اختاره ، على نحو ما اقتبسناه منه في صدر هذه الصفحات• و قد برهنت بما لا مزيد عليه على أنه لم تكن لديه الا نسخ قلائل هي التي نشر صورا زنكوغرافية لصفحات منها وبعض منها نسخ جد حديثة ، و على أنه لم يجر أي مقارنة حتى بين هذه النسخ بل اعتمد فقط على طبعة ( علي مقبل ) السنندجي ، ولكنه لاحظ ما اذا كانت هناك قطعة شعرية أو بيت في نسخة اخرى غير موجودة في طبعة علي مقبل • ففي هذه الحالة استنسخ مثل هذه القطع الشعرية أو الابيات وأدخلها في صلب الديوان الذي أعده • ومما استدللت به على ذلك أن نسخته لاتختلف الا قليلا عن نسخة ( علي مقبل ) و أن الاختلافات المدونة في الهوامش قليلة جدا و غير ذات أهمية في الاغلب ، في حين أن طبعتنا التي ثبتنا فيها غالبية الاختلافات الموجودة في كل بيت في نهاية الشرح تتضمن عددا غير قليل من الاختلافات في أغلب الأبيات و في معظم

النسخ المخطوطة التي كانت لدينا ، و بعض منها مما كانت لدى الدكتـور خزندار نفسه بعض الوقت . و قد تساءلت خلال هذه المناقشة عن السبب الذي حدا بالدكتور لئلا ينشر صورا لصفحات من جميع النسخ التي ادعى توافرهـا لديـه .

لقد احتوت طبعتنا على قصائد غير معروفة سابقا لنالي ، وقد نشرها الدكتور معروف كذلك ، لكنه ادعى انها كانت موجودة لديه و لم يقتبسها من طبعتنا نحن . وللبرهنة على ذلك فقد ادعى أنه انتهى من اعداد كتابه تماما في ربيع ١٩٧٥ وقد أرخ لمقدمته بالأول من نيسان من تلك السـنة وأكد في خاتمة كتابه ان كل شيىء من هذا الكتاب ، بما في ذلك مقدمته ، قد انتهى اعداده في ذلك التاريخ ، الا أنه ناقض نفسه بنفسه اذ تحدث في المقدمة نفسها عن كتاب للسيد مسعود محمد صدر في ١٩٧٦ وعن مقالات لنفسه كتبها في ١٩٧٦ ايضا .. ومما استدللت به كذلك على اقتباس تلك القصائد من طبعتنا انها احتوت في طبعة الدكتور حتى على الاشارات الكتابية التي ثبتناها نحن في تلك القصائد في حين أن الدكتور يتحاشى عادة تثبيت الاشارات تفاديا لما قد ينجم عن ذلك من تثبيت اشارات غير دقيقة فيما يتعلق بمكان استعمـالها . وان أي اختلاف بين نصوص تلك القصائد في الطبعتين غير موجود اطلاقا .. وقد طلبت من الدكتور أن ينشر صورا زنكوغرافية لمخطوطات تلك القصائد ان كان يملكها حقا .

هناك قطعة شعرية منسوبة الى نالي نظمها باللغة التركية كما أن هنـاك بيتا واحدا ايضا بالتركية نسب اليه . وقد جرينا نحن في طبعتنا على صحة هذه النسبة مستدلين بالمستوى الفني الرفيع للقطعة و للبيت و على وجودها في عدة نسخ مخطوطة موثوقة . الا أن الدكتور نفى صحة هذه النسبة وادعى جازما أنها مختلقة ، وقد تصور الدكتور أن القطعة الشـعرية والبيت المفرد

يؤلفان غزلا واحدا وثبتهما في مقدمة ديوانه على هذا الاساس • وقد قلت في مناقشته أن من لا يستطيع التمييز بين قطعة شعرية غزلية و بيت مفرد في التصوف ، ولا يدرك اختلافهما في القافية وفي البحر الشعرى كذلك فضلا عن وجود الاخطاء اللغوية العديدة في النص الذي ثبته ، لا يحق له أن يعتبر نفسه حكما يعطى مثل هذا الرأى القاطع •

وقد ناقشت كذلك مسائل عديدة أخرى ذكرها الدكتور معروف في مقدمته ، لكن الأهمية الاساسية لكتابى هذا تكمن في ما قمت به بالنسبة لفحص نصوص الاشعار كما ثبتها الدكتور ولمحتويات قاموسه •

ففي مجال النصوص الشعرية ثبتت أخطاء لغوية وكتابية وعروضية متعددة على النص الذي ثبته الدكتور ، كما سجلت ملاحظات نقدية عديدة على عمله ، مبرهنا بذلك على صحة ما ذهبت اليه من أنه لم يجر أي مقارنة بين المخطوطات ، مستشهدا بوجود العديد من النصوص ذات القيمة الشعرية التي لا تثمن ، في حين أن الدكتور خزندار أتى ببدائل غير ذات مستوى فني، لاالشيىء الا مجاراة للنص الذي ثبته (علي مقبل) في طبعته بسبب صعوبة قراءة المخطوطات القديمة التي دونت بالخط الفارسي • وفي هذا المجال برهنت أكثر من مرة على أن الدكتور لم يتوصل الى سبر أغوار نالى وفهم قصائده ، والا لاختار في أماكن عديدة نصوصا اخرى غير النص الذي اعتمد عليه وهو نص السيد على مقبل •

أما في نقد قاموسه والذي اقتضى مني عمل حوالي أربعة اشهر ، فقد قارنت المفردات الواردة في الابيات الواحدة بعد الاخرى بتفسيراتها التي ثبتها في القاموس ، فتوصلت الى اكتشاف حقائق مذهلة أذكر فيما يلي بعضا منها •

● لا صحة مطلقا للوصف الذي اطلقه الدكتور على قاموسه والذي اقتبسته منه في صدر هذا البحث ، من أنه ، أي القاموس ، « يتناول شرح

وتفسير جميع الكلمات والمفردات والمصطلحات والتعابير الشعرية التي وردت في النصوص •• الخ » •

● اعتمد الدكتور معروف في اعداد قاموسه على ( فرهنگ عميد ) وهو قاموس فارسي – فارسي وعلى المنجد ، وليس له اي مرجع كتابى آخر في هذا المجال ومع ذلك فانه لم يشر الى اسم أي منهما •

● لم يلاحظ بتاتا ما اذا كان المعنى المذكور للكلمة المستعملة في اللغة الفارسية أيضا ، موجودا في اللغة الكردية أم لا ، وما اذا كان نالى قد استعمل الكلمة لذلك المعنى أم لا ، وهذا هو ما فعله كذلك بالنسبة للكلمة العربية الاصل المستعملة في الكردية •

● ثبت العديد من المعانى التي لم تكن تمتلكها الكلمة لا في الفارسية ولا في الكردية في عهد نالى •

● أثبت الدكتور في ترجمة المقتبسات من قاموس العميد أنه يجهل اللغة الفارسية ، ولذلك فان ترجماته مليئة بالأخطاء الفاحشة ، وقد ذكرت العديد من الامثلة على ذلك •

● غير حركات العشرات من الكلمات الكردية وحركها على اساس كونها فارسية لأنه وجد هذه الكلمات في النواميس الفارسية، متناسيا أناللغتين، بوصفهما من عائلة اللغات الايرانية ، تشتركان في العديد من الكلمات وان كانت حركاتها تختلف لدى احداهما عنها لدى الاخرى •

● لم يتطرق ابدا الى الفنون البلاغية التي استخدمها نالى في أي مفردة ، وذلك ما أوقعه في أخطاء فظيعة • وعلى سبيل المثال يصف نالى حماره بأنه ( ذو قلم جميل ) وهذا التعبير في اللغة الكردية كناية عن ( ممشوق القوام ) • ففسر الدكتور ذلك بأنه أديب ممتاز و شاعر فحل وكاتب عظيم •

● لم يشر الدكتور الى أي من الاشارات العلمية والدينية والتاريخية والأسطورية التي ثبتها الشاعر . وهكذا فان القاريء لا يفهم أبدا من قاموس الدكتور معروف ان لكلمة ( رقود ) مثلا صلة برقود اصحاب الكهف .

● ابتعد الدكتور عن الاجواء التي يخلقها الشاعر ابتعادا أوقعه في أخطاء فاحشة . وعلى سبيل المثال يتحدث الشاعر في احدى قصائده وقد نظمها في طريق مكة عن ( العشاق ) ، ويفسر الدكتور كلمة العشاق هذه بأنها تعني الذين يطاردون نساء الغير ويلاحقونهن لقضاء وطرهم منهن ... في حين أن العشاق لدى نالى في هذه القصيدة تعنى محبي الحقيقة والسائرين وراء الله ورسوله ، أى أولئك الذين يسمون في عالم التصوف بأصحاب العشق الحقيقي ..

● ان عدم اطلاع الدكتور خزندار على التراث الأدبي الاسلامي والشرقي يوقعه في مزالق لا مخرج له منها . وعلى سبيل المثال يتحدث الشاعر عن ( تسبيح الطيور ) امام النبي سليمان ، ويفسر الدكتور ( تسبيح الطيور) هذا بأنه (سبحة حباتها من بيض الدجاج ، وهي كناية عن كبر حبات السبحة).

● يبرهن الدكتور في قاموسه على أنه يجهل اللغة العربية كذلك . وعلى سبيل المثال فهو لا يفرق بين (أحياء) و (إحياء) و (جَفاء) و (جُفاء) و ( غناء ) و (غنى ) .

● ويبرهن كذلك ، في أكثر من موضع ، على أن حظ اللغة الكردية ليس أحسن بكثير من حظ اللغة العربية في قاموس الدكتور ، وقد ذكرت أمثلة عديدة لذلك .

● يجزىء الدكتور الكلمات المركبة التي تعطى بمجموع أجزائها المعنى المقصود ، ويفسر مفرداتها واحدة واحدة ، مما يفقد المعنى المطلوب من الكلمة المركبة .

● لايفرق الدكتور بين ( ياء المصدرية ) و ( ياء النسبة ) في الكلمة الكردية ، كما لا يفرق بين المصدر والصفة وبين اللازم والمتعدى •

● وهناك حقائق أخرى عديدة ذكرتها بالتفصيل في متن الكتاب ولا مجال لاستعادتها هنا لأن المقام يطول بنا •

هذا كله الى جانب أن مصطلح ( معجم الشاعر فلان ) لا ينطبق على أي معجم قاموسي يرتب لكلمات شعره وان كان صحيحا ١٠٠٪ • فلهذا المصطلح مفهوم آخر يتعلق بابداع الشاعر في الاشتقاق ونحت الكلمات والاتيان بالغريب في الصورة وفي المعنى ، كما هو مذكور في أمهات الكتب المعنية بالدراسات الادبية •

وفي خاتمة الكتاب قدمت عرضا لبعض الأخطاء الواردة في قاموس الدكتور لبعض مفردات حرف الألف كنموذج لما عليه البقية وكبرهان لا ينقض على صحة ما ذكرته من قبل •



# دفاعا عن الأدب ..
# دفاعا عن نالي ..

**« ديوان نالي و معجم ديوان نالي » للدكتور معروف خزندار**
**في كفة الميزان النقدي**

( باللغة الكردية )

مع عرض واف لمضامين الكتاب باللغة العربية

تاليف

**محمد الملا عبدالكريم**

بغداد ــ ١٩٧٩

★ ★ ★

MUHAMMAD I MALA KAREEM

# IN DEFENSE OF LITERATURE
# IN DEFENSE OF NALI

Dr. Maa'roof Khaznadar's (( Collection of Nali's Poetry and Nali's Dictionary )) in the Scale of Literary Criticism
( In Kurdish )

Baghdad — 1979

★ ★ ★


٦٠٠٠ دانــه لەم کتێبە لــەچاپدراوە
دەستپێکردنی لەچاپدان ١٩٧٩/٢/٢
تەواوبوونی لــەچاپدان ١٩٧٩/٤/١٨

**ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدا**
**( ٥١٧ )ی ساڵی ١٩٧٩یە**

**دانەی بە ( ٧٥٠ ) فلسە**